مافی لە چاپدانی پارێزراوە بۆ
نارین

نـــــاوی کتـــــێب: منداڵە زیرەکان
نــوسیـــــنــــــی: یعقوب حسين عبدالكريم الراوي
نەخــشەسازی نـــاوەوە: کۆمپیوتەری نارین (محمد علی)
نۆرە و ســـاڵی چـــاپ: یەکەم/ ٢٠١١
ژمـــــارەی سپــــاردن: (١٢٤٠) ساڵی (٢٠٠٩)ی پێدراوە.

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
website: www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)
مۆبایل: ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠ ٠٠٩٦٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ ۚ وَإِن تَعْفُوا۟ وَتَصْفَحُوا۟ وَتَغْفِرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾﴾

سورة التغابن: (١٤-١٥)

## پێشکەشە:

- پێشکەشە بە دایكو باوکی خۆشەویستم کە پەروەردەیان کردم لەسەر ڕێگایەکی پێغەمبەران کە ئاینی ئیسلامە.
- پێشکەشە بەو هەموو گەنجانەی کەوا دەگەڕێنەوە ژێر ڕۆشنایی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەری نازدار محمد(ﷺ).
- پێشکەشە بەو کەسانەی کە ئەم پەرتووکە دەخوێننەوەو پەندو ئامۆژگاری لێوەردەگرن.
- پێشکەش بێت بەو موسڵمانە باوەڕ بەتینانەی خۆیان کردە قوربانی لە ڕێی ئەو ئایینە پاکەی ئیسلام و بەختەوەربوون.
- پێشکەش بێت بە خێزانی بەڕێز و بەختەوەرم دایکی نورا.

## سوپاس و پێزانین

- بۆ بەڕێز مامۆستا مەلا نامق مەلا إسماعیل گەردی لە شارۆچکەی (پیرمام) کە یارمەتیەکی زۆری دام لە نووسینی ئەم پەرتوکە.

# پێشەكی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهدي الله فهو المهتد ومن يضلل فلن تجد له ولياً مرشدا، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ آل عمران:١٠٢.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾ النساء: ١.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب.

﴿وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ الأعراف: ٤٣.

خوێنەری بەڕێز:

لە ژیانی هەر یەك لە ئێمەدا چەندین سات و ڕووداو هەیە بۆ شتی باشتر یان بۆ شتی خراپتر دەمانگوزێتەوە، هەیە لە ئێمە لەو ساتانە بێ ئاگا دەبێت و بەردەوام دەبێت لە ژیانی بێ ئامانج، هەیە بە ئاگا دێتەوە و هەست بە ئامانجی دەكات لە ژیان.

لە قورئانی پیرۆزدا زۆر جار ئەبینین خوای پەروەردگار نمونە بە ماڵ و منداڵی هێناوەتەوە وەكو دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٤ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ١٥﴾ التغابن.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بەڕاستی هەندێ لە ژنان و منداڵانتان دوژمنن بۆتان، سەرقاڵتان دەكەن لە خواپەرستیو كاری چاكە بەهۆی خۆشەویستیانەوە بۆیان،

جا وریابن و خۆتان بپارێن لە خۆشەویستی ناشەرعی بۆیان، جا ئەگەر بیان بەخشن لەوە کە پەکیان خستن لە کۆچکردن، و بیانپۆشن و لێیان خۆش بن، بێگومان خوا خوایەکی زۆر لێبوردەیە، زۆر دڵاوایە، بەڕاستی ماڵ و منداڵەکانتان بەڵان بۆتان، پێیان تاقی دەکرێنەوە، تا دەرکەوێ کامتان گوێڕایەڵی دەکەن، و کامیشتان یاخی دەبن، کەوابوو بێدارو هۆشیاربن پێیان فریو نەخۆن! لە کاتێکدا خوای میهرەبان پاداشتێکی گەورەی لایە، واتە: بەهۆی ئەو سەروەت و سامان و ژن و منداڵانەتانەوە دەستخەڕۆ نەبن[1].

خوێنەری سەنگین: هەق نەناسینو پێ ئاشنا نەبوون چەندە گرفت و کێشە بووە لە ژیانی مرۆڤدا، بۆیە پێویستە لە ژیانی هەر یەکێك لە ئێمە پەندو ئامۆژگاری وەربگرێت لەو هەموو سەرگوزەشتانەی کە لەمەوپێش ڕوویانداوە یان بەردەوامن لە ڕودانیان.

هەندێ سەرگوزەشتە هەیە خۆشی تیایەو هەندێکی تریش هەیە ناخۆشی تیایە، منیش بەپێی توانا کۆکردنەوەی ئەم سەرگوزەشتانەم خستە بەردەستتان، بۆ ئەوەی خزمەتێك بە ئایینی ئیسلام و گەلی کوردی بڕوادار بکەم، بەو هیوایەی ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بەدەست بهێنین، و ببێتە توێشویەك بۆ دواڕۆژ.

لەناو پەرتوکخانەکانی زمانی کوردی بابەتێکی زۆرم بەرچاو نەکەوت سەبارەت بەم پەرتوکەی کە لەبەر دەستت دایە، بۆیە بە پێویستم زانی پەرتوکێکی لەم چەشنە ئامادە بکەم، و ناوی بنێم بە (منداڵە ژیرەکان).

لە کاتی خوێندنەوەی ئەم پەرتوکە بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەم منداڵانە چەندە زیرەك و زیتەڵ بوونەو ئێمەی باوەڕداریش پێویستە لەسەرمان هیمەتمان پێیان بەرز بێت، لەگەڵ هیممەت بەرزاندا بڕۆینو منداڵەکانمان ڕابهێنینن لەسەر پەروەردەیەکی ئیسلامی.

سەرگوزەشتەی ئەم منداڵانە لە نێوان (١) ڕۆژی تا تەمەنی (١٤)ساڵیدایە، چونکە زانایان دەڵێن: تەمەنی منداڵ لە (١) ڕۆژیەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە تەمەنی (١٤) ساڵی.

کەوابوو منداڵ پێویستی بە پەروەردەکردنێکی کاتی هەیە کە پێی پەروەردە بکرێت، بۆیە مۆڵەتی سێ ساڵی بۆ دانراوە تا منداڵ دەق بگرێت و لەسەر پەروەردەیەکی ئیسلامی پەروەردە بکرێت.

---

١ تەفسیری ڕامان لە ماناو مەبەستی قورئان، ئەحمەد کاکە محمود، لا ٨٥٢.

پێویستە ڕەچاوی ئەو جیاوازیە بکەین لە نێوان ئەو کات و سەردەمەی ئێمەی تیا گەورەبوین، و ئەم کات و سەردەمەش کە ئێستا منداڵەکانمانی تیا دەژین، هەروەکو پێشەوا عومەری کوری خەتاب(ﷺ) دەڵێت: منداڵەکانتان بە چاکی پەروەردە بکەن و ڕەچاوی ئەوە بکەن کە سەردەمی ئەوان جیاوازە لەو سەردەمەی کە ئێوەی تیایدا گەورە بوون.

بۆ نمونە: ئێستا گۆڕانێکاریەکی زۆر گەورە بەرپابووە لەم سەردەمەدا بەهۆی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و بەرنامەی منداڵان و یاری منداڵان و بیرو هۆشیان، کە لە سەردەمی ئەواندا نەبوە، بۆیە دەبێت ئاگاداری ئەو گۆڕانکاریانە بین لە پەروەردەدا.

بە پێویستم زانی کە خۆم خەریك بکەم بە کۆکردنەوەی ئەم سەرگوزەشتانە، بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری لێیانەوە وەربگرین، ئەگەر نا با منداڵەکانمان ڕابهێنین لەسەر خوێندنەوەی ئەم سەرگوزەشتانەو بۆیانیان باس بکەین، بۆ ئەوەی ئەوان ڕەفتاری ئەم منداڵانە هەڵبگرن.

باسکردنی سەرگوزەشتە شتێکی هەستیارە، هەروەکو لە سەردەمی عومەری کوری خەتابدا(ﷺ) تەمیمی داری لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) هەفتەی جارێك باسی ژیان و سەرگوزەشتەی پێغەمبەران و گەلانی پێشوی بۆ موسڵمانان دەکرد، وەلەسەردەمی عوسمانی کوری عەفاندا هەفتەی دووجار باسی ژیان و سەرگوزەشتەی پێغەمبەرانی بۆ موسڵمانان دەگێڕایەوە.. لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆشدا هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بەهۆی چیرۆك و فیلم و شانۆگەریەوە چیان بویّ بەناو جەماوەردا بڵاوی دەکەنەوە.

ئەرکێکی زۆر گەورەمان لەسەر شانە، ئەویش پەروەردەکردنی منداڵەکانمانە، کە بەجوانترین شێواز پەروەردەیان بکەین، بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا سزامان نەدات، لەسەر منداڵەکانمان.

لە کۆتاییدا بەم وشە پڕشنگ دارانە ئەم پەرتوکە دەست پیّ دەکەم، و لە خوای پەروەردگار خوازیارم کە لە تەرازوی کارە چاکەکانم دایبنێ بۆ ئەو ڕۆژەی کە نەپارەو نە ماڵ و نە منداڵ فریامان ناکەوێت، جگە لە دڵێکی پاکو بێگەرد.

وصل الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

يعقوب حسين عبدالكريم الراوي

E-mail: al_rawi١٩٨٧_i@yahoo.com.

# سەرگوزەشتەکانی

# منداڵـــە ژیرەکـــــان

(١) پێغەمبەر ﷺ.

(٢) کچێکی تەمەن (١٤) ساڵی خەڵکێکی زۆر لەسەر دەستی موسڵمان دەبن.

(٣) ڕۆڵە شیرینەکەم.

(٤) پێشەوا مالیك و منداڵێك.

(٥) ڕۆژی بەدر.

(٦) یادگاری لاوێتی.

(٧) کەرو لاڵێکی تێگەیشتوو.

(٨) ئەو چرایەی ژیانی ڕووناك کردمەوە.

(٩) مناڵەکەم ڕێنموویی کردم.

(١٠) موسڵمانبوونی قەشەیەك لە تەنزانیا.

(١١) کارەکەری کچەکەی فیرعەون.

(١٢) چاڵە ئاگرینەکە.

(١٣) کوڕی قەشە.

(١٤) ویستی بەرەو فەسادی ببات.

(١٥) لە پاش مردنی بۆنی میسکی لێ دەهات.

(١٦) خوایە گیان لەناو سگی باڵندەدا حەشرم بکەیت.

(١٧) منداڵەکەت ئاوا پەروەردە بکە.

(١٨) لە ڕۆژی دوایی ناترسیت؟

(١٩) ئاگات لە خۆت بێ.

(٢٠) ئەی خودا لە کوێیە؟

(٢١) منی لە نەفامی و نەزانین ڕزگار کرد.

(٢٢) تۆ منداڵیت.

(٢٣) کوشتنی (ئەسقف).

(٢٤) لەشکری موسڵمانان بەم قورئانەوە سەر دەکەوێت.

(٢٥) مەشاجیع ی کوڕی وسف.

(٢٥) کابرای خورما فرۆش.

(٢٦) ولمن خاف مقام ربه جنتان.

(٢٧) گەڕانەوەی حاجیەك.

(٢٨) موسڵمان بوونی برای مایکل جاکسۆن.

(٢٩) ئیسحاقی قەشە.

(٣٠) کۆتایی دونیا پەرستان.

(٣١) ئەم منداڵە ئەناسیت.

(٣٢) مالیکی کوڕی دینار.

(٣٣) پێشەوا ئیبنو سیرین.

(٣٤) خۆڵی بەهەشتم دەوێت.

(٣٥) پێشەوا (ئەبوحەنیفە) وەڵامی بێباوەڕان ئەداتەوە.

(٣٦) ڕۆژی جەژن.

(٣٧) لە سەردەمی خەلیفە عومەردا.

(٣٨) تەڵاقی نەکەوتووە.

(٣٩) عومەیری کوڕی سەعد.

(٤٠) گفتوگۆیەك لە نێوان منداڵێك و حەجاجی کوری یوسف.

(٤١) نوێژی بەیانی.

(٤٢) بۆچی دەگریت؟

(٤٣) ئەبوحەنیفەو چاوی عەقڵ.

(٤٤) کیشوەری پاکیزەیی منداڵ.

(٤٥) مافی دایك و باوك.

(٤٦) شەریفۆ.

(٤٧) تەنها خەندەیەك.

(٤٨) منالێکی تەمەن (١١) ساڵەی نابینا.

(٤٩) ئیبنو تەیمیە.

(٥٠) لەخۆبایی بوون.

(٥١) خوای گەورە ڕۆزی دەرە.

(٥٢) گەڕان بە دوای زانستدا.

(٥٣) ستەم کردن.

(٥٤) جورەیج و منالێکی ساوا.

(٥٥) چاکە لەگەڵ دایك و باوکدا.

(٥٦) نازانم گوێڕایەڵی کێ بکەم.

(٥٧) ملوانکەکەم لێ مەدزن چونکە هەتیوم.

(٥٨) جگەر گۆشە.

(٥٩) سەرگوزەشتەی من لەگەڵ منالەکەم.

(٦٠) هیچ تاوانێکم نەبوو.

(٦١) لە ڕۆژی جەژندا.

(٦٢) مرۆڤ بەدوو بچوکەکەیەتی.

(٦٣) تۆ کوڕی کێیت؟

(٦٤) من پەروەردەی دەوڵەتەکەی تۆم.

(٦٥) ئەم دیوەخانەی من قەدرو ڕێزی نەماوە کێ بیەوێت دێتە ژوورەوە تەنانەت مندالّیش؟

(٦٦) جەنگی ئوحد.

(٦٧) ڕۆڵەکیان لێرەوە هێرش بەرە سەر دوژمن. (٦٨) عومەیر گریا.

(٦٩) سەرپێچیم دەکەیت تۆ کوڕێکی کەنیزەکی؟

(٧٠) پەیمانم داوە بە دایکم درۆ نەکەم.

(٧١) دلّ تێری موسلّمان.

# سەرگوزەشتەی یەکەم

## پێغەمبەر محمد ﷺ

پاش پێنج ساڵ لـە بیابـان حەلیمـە موحەممـەدی بـردەوە لای دایکـی.. لـەو ماوەیـەدا موحەممەد ببوە منداڵێکی چوست و چالاك و چاوکراوەو تێگەیـشتوو زیـرەك، عەرەبیـەکی باشی دەزانی، گەلێ جار بە عەرەبەکانی دەوت: (من لە هەموتان ڕەسـەنترم، چـونکە مـن قورەیشیم، لە بیابان لەلای بەرەی بەکر بـەخێو کـراوم). شـایەنی باسـە ژیـانی ئـەو پێـنج ساڵەی بیابان شوێنێکی تایبەتی و تەواوی لە دڵی پێغەمبەر دروست کرد.

حەلیمەو ماڵەکەو منداڵـەکانی حەلیمـەی بەدرێـژایی تەمـەنی لـەبیر نـەکردو پەیوەنـدی لەگـەڵیان نەپـچڕاند، تەنانـەت لـەو کـاتی کـە ژنـی هێنـا، حەلیمـە سـەردانی کـردو پێغەمبەر(ﷺ) زۆری ڕێز گرت، چل سەر مەڕی دایێ.

پێغەمبەر(ﷺ) ماوەی دوو ساڵ لە مەککە لەلای دایکی مایـەوە، دوایـی دایکـی لەگـەڵ (بەرەکەی) بەخێوکەری بردی بۆ مەدینە، بۆ لای خاڵەکانی لەبەرەی (نەجار) بـۆ ئـەوەی بیان ناسی، بەرەکە دەڵێ: لە مەدینە کە جولەکەکان چاویان پێ دەکەوت، دەیانوت: ئـەو کورە پایەکی گەورەی دەبێت و دەبێتە پێغەمبەری ئەو میللەتە. لەبەر ئـەوە دایکـی زۆری لێ ترسا نەوەکو خراپەیەکی بەسەر بێنن، بۆیە زوو گەڕایـەوە بـۆ مەککـە. بـەڵام لـە ڕێگـا ئامینەی دایکی نەخۆش کەوت، گەیشتنە شوێنێك پێی دەڵێن: (ئەبواء) لە نێوان مەدینـەو مەککە، کۆچی دوایی کرد، لـەوێ ناشـتیان، ئـەمجا لەگـەڵ بەرەکـە دوو بـە دوو گەڕانـەوە مەککە، لە ڕێگا زۆر هەستی بە بێکەسی و هەتیوی کـرد، پـاش ئـەوەی کـە هـۆگری داکـی ببوو، ڕەنگە گەلێ جاریش لە ماوەی ئەو دوو ساڵەو لە ڕێگا باسی باوکی بۆ کردبێ. ئـیتر دەردی کۆچی دایکی لەسەری گەلێ گران بوون لەو دەمەوە تاکو بـوو بـە پێغەمبـەر(ﷺ) شوێنی گۆڕەکەی لە بیر نەکرد.

لە پاش ئامینە، عەبدولمتەلیبی باپیری بردیە لای خۆی، ئەویش زۆری خۆش دەویست، خوا وایکردوە باپیر نەوەیان زۆر خۆش بویّ، بە تایبەت پێغەمبەر(ﷺ) کە کوڕی لاوێکی خۆشەویـست بـوو، پێغەمبـەر(ﷺ) کـوڕێکی زۆر بـەتواناو وێـچوو بـوو، لەبـەر ئـەوە عەبدولموتەلیب هـیچ کاتێك لێـی بیّ ئاگا نـەدەبوو، نەیدەهێشت لێـی دوور بکەوێتـەوە، شوێنێکی تایبەتی هەبوو لەلای، هیچ کاتێك بـەبیّ ئـەو نـانی نـەدەخوارد، دەبوایـە لەگـەڵ خـۆی دایـبنیّ، ئەوەنـدە ڕووی دەدا بـە پێغەمبـەر(ﷺ)، ئەوەنـدەی ڕووی نەداوەتـە کوڕەکانی.

هەر کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بیوستبایە دەچوە لای باپیری، با کـاتی خـەوتنیش بوایـە، هەموو جار کە جێگایان بـۆ عەبدولموتـەلیب لـەبن دیـواری کەعبـە ڕادەخـست دەچـوو لـە تەنیشت باپیری دادەنیشت، مامەکانی تێیان دەخوڕیەوە بۆ ئـەوەی دورکەوێتـەوە، بـەڵام عەبدولموتەلیب دەستی بە پشتی دادەهێنا، و دەیوت: لێی گەڕێن، بەو خوایە ئەو کـوڕەی من پایەکی زۆر بەرزی دەبێت، گەلیّ جاران بە ئەبو تالیب و بەرەکەی دەوت: زۆرتان ئاگا لێی بێت هەموو جولەکەکان دەڵێن: ئەو کوڕەی من دەبێت بە پێغەمبەر(ﷺ).

لە پاش دوو ساڵان عەبدولموتەلیبیش نـەخۆش کـەوت، ڕایسپارد لـە دوای خـۆی ئـەبو تاڵیب بیباتە لای خۆی و ئاگاداری بکات. عەبدولموتەلیب کۆچی دوایـی کـرد، ئـەنجا ئـەبو تاڵیب بردیە لای خۆی، ئەویش وەك باوکی زۆری خۆش دەویست.

پێغەمبەریش(ﷺ) لە تەمەنی منداڵیـدا زۆر ڕێـك و پێـك و پـاکو خـاوێن و جـوان بـوو، تەندروستیەکی زۆر باشی هەبوو، بـەیانیان کـە لـە خـەو هەڵدەسـتا دەم و چـاوی گـەش و جوان بوو، پرچـی بـەلول و ڕێـك بـوو، دەتـوت: شـانەکراوەو ڕۆنـی لێدراوە. ئـەبو تاڵـیب هۆگری ببو، لەگەڵ خۆی دەینواندو پێکەوە نانیان دەخوارد.

پێش ئەوەی پێغەمبـەر(ﷺ) بـچێتە لایـان، لەبـەر دەسـت کـورتی گـەلیّ جـار تێریـان نەدەخوارد، بەڵام کە پێغەمبەر(ﷺ) چوە لایان، خواردنیان لەبەردەمایەوە، هـەموو جـار

ئـەبو تاڵیـب پێـی دەوت: تـۆ لـەو ماڵـە پـیرۆزی، کـە نانیـشیان ئامـادە دەکـرد کـەس نەیدەخوارد، تاکو ئەو نەچوبایەتە سەر نان خواردن.

پێغەمبەر(ﷺ) تەمەنی بوو بە دوانزە ساڵ ڕۆژێك ئەبو تاڵیبی مامی خۆی ئامـادە کـرد بچێتە شام، لە کاتی ڕۆیشتندا پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێکرد لەگـەڵ خـۆی بیبـات، ئـەویش دڵی نەرم بوو پێی وت: سوێند بەخوا لەگەڵ خۆم دەتبەم، قـەت نایـەڵم لێـك جیاببینـەوە، کاروان کەوتە ڕۆیشتن، تاکو گەیشتنە شـوێنێك لـە خـوارووی شـاری (شـام) پێیـان دەوت: (بوصرا).

پیاوێکی راهیب کە ناوی بوحەیرا بوو، زانایەکی مەسیحی بوو، لەسەر بەرزاییەك دەژیا، خۆی لەکەس نەدەگەیاند، لە خانوەکـەی نەدەهاتـە دەرەوە، کـە کاروانەکـەی ئـەبوتاڵیب گەیـشتە نزیکـی بەرزاییەکـە لـە ژێـر دارێکـدا خـستیان، بوحـەیرا لـە دورەوە پـێش ئـەوە کاروانەکەی بەدی کردبوو سەرنجی دابوونیٚ، بوحەیرا فەرمانیدا کە خواردنیان بـۆ دروسـت بکەن، ئەنجا ناردی بەدوایانـدا، پێیـان وتـن: پیـاوانی قـورەیش بوحـەیرا خـواردنی بۆتـان دروست کردوە، هەموتان وەرن بۆ نان خـواردن، کەسیـشتان دوا مەکـەون. ئـەبو تاڵیـب و پیاوانی تر چـوون پێغەمبـەریان لـەلای کـەل و پەلـەکان بەجێهێـشت، کـە چـوون یـەك لـە پیاوەکانی قورەیش پێی وت: ئەی بوحەیرا ئێمە هەر چەند جاریٚ هاتبین بۆ ئێرە تـۆ هـیچ جارێك خواردنت بۆ ئێمە دروست نەکردوە، دیارە ئەمڕۆ مەبەستێکت هەیە، ئـەویش وتـی: بـەڵیٚ مەبەسـتێکم هەیـە، بـەڵام ئێـوە میـوانن حـەزم کـرد ڕێزتـان بگـرم، هـەموو لەسـەر خواردنەکـە کۆبونـەوە، بوحـەیرا پرسـی: ئایـا کەسـتان دوانەکـەوتوە؟ وتیـان: هـەمومان هاتوین تەنیا منداڵێك نەبێت، بوحەیرا وتی: خێراکەن بـچن بیهێـنن، ئـەوە شـتێکی ناڕێکـە ئەو منداڵە لە خواردن دوا بکەویٚ.

لەو کاتی پێغەمبەر(ﷺ) هـات تـاکو کـاتی ڕۆیـشتن، بوحـەیراش هـەر سـەرنجی دەدا، نانەکە خواردراو خەڵکەکە بڵاوەیان کرد. ئەبو تاڵیب و پێغەمبەر(ﷺ) مانەوە، بوحەیراش چوە لایان، و ڕوی لە پێغەمبەر(ﷺ) کردو پێی وت: بـە (لات و عـوززا) سـوێندت دەدەم، هەر پرسیارێکت لیٚ دەکەم بەڕاستی وەڵامم بدەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: مـن ڕقـم

لەوانەیـە بەوانـەم سـوێند مـەدە، بوحـەیراش وتـی: بۆیـە بەوانـەم سـوێند دای، چونکە خێڵەکەت بەوانـە سـوێند دەخۆن، ئـەنجا وتـی: ئـەمجارە بـەخوا سـوێندت دەدەم، وتـی: فەرموو چیت دەوێ بیڵـێ. بوحـەیراش پرسـیاری کـرد لەبابـەت ژیـانی و وتـەو هەڵسان و دانیشتنی، پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامی هەموی دایەوە، ئەمجا بوحەیرا ڕووی لە ئـەبوتاڵیب کرد، و وتی: ئەو منداڵی چی تۆیە؟ ئەبو تاڵیب وتی: ئەوە کوڕی منە، بوحەیرا وتی: نـابێ باوکی ئەو منداڵە مابێ. ئەنجا ئەبو تاڵیب وتی: ئەوە کـوری برامـە، و ئـەو کـوڕە لـە زگـی دایکی بوو باوکی مردووە، بوحەیرا وتی: حەز دەکەم بە خێرایی بیبیتەوە وڵاتی خۆتان، و ئاگاداریەکی باشی بکەیت، چونکە ئەوەی من لەو کوڕەم بـینی ئـەوان لێـی ببیـنن توشـی خراپەیـەکی زۆری دەکـەن، ئـەبو تـاڵیبش بـە وتەکـەی بـاوەڕی کـرد، هـەر بـە خێرایـی بازرگانیەکەی جێبەجێ کردو گەڕایەوە مەککە[1].

هەروەها ڕۆژێکیان پێغەمبـەر(ﷺ) یاری دەکـرد لەگـەڵ منـداڵانی هاوتەمـەنی خـۆی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: منداڵانی قورەیشم دەدی بەردیان دەگوێزایەوە، کراسەکەیان دەئاڵاند لە ملیان، و بەردیان دەخستە سەری بـۆ ئـەوەی لـە زبـری بـەردەکان بپـارێزرێن، منیش ویستم وەکو ئەوان بکـەم، لـەپڕ یـەک مـشتەکۆڵەیان پێـدا کێـشام و پاشـان گـوتی: خۆت جوان داپۆشە بە کراسەکەت، فەرمووی: منیش کراسەکەم دادایەوەو بەردەم لەسـەر شان دەگوێزایەوەو شەرمگام بەدەرەوە نەبوو لەناو هاوڕێکانمدا[2].

---

(١) ئەو سەرگوزەشتەی بوحەیرای راهیب گەلێ لە زاناکانی ئیسلام بە بێهێزیان داناوە، بـەڵام سـەیر لەوەدایە، ئـەو مـاوە کورتـەی پێغەمبـەر(ﷺ) لەگـەڵ بوحـەیرا بـوو، ڕۆژهـەڵات ناسـە مەسـیحیەکان (مستـشرقین) کردویانەتـە بەنـدو بالۆرەیـەکی زۆر گـەورە، چـەند کتێبیـان لەسـەر نوسـیوەو دەڵـێن: بوحـەیرا هـەموو فـەرمانێکی پێغەمبەرایـەتی فێـری موحەممەد کرد.

ئەو هەموو زانست و زانیاریانەی لە یاساو رەوشتی ئیسلام بەم ماوە کورتەی کە کاتی نانخواردن، و لە تـەمەنی (١٢) سـاڵی لـە بوحـەیرای وەرگـرت، جگـە لـەوەش زۆرتـرین ڕووداوەکـان و یاسـایەکان و فەرمانـەکانی ئیـسلام کـە خـواو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیان لەسەر داوە هەمووی پاش ئەو میواندارییە بووە، و ڕووی داوە، هیچ فەرمانێکیشی بـەبێ ڕوداو و پرسیار بـۆی نـەهاتوە، ئایا ئـەو بوحەیرایـە چـۆن ئـەو هـەموو ڕووداو و کـردەوە چـۆن ئـەو زانـین و زانـستەی فێـری کابرایەکی عەرەب کرد! دوور بوو لە مەسیحیەت، بۆچی فێری کابریەکی مەسیحی نەکرد، تـاکو ئێـستاش مەسـیحیەکان دان بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد دانانێن و دوژمنایەتی دەکەن.

٢ تربیه الاولاد في الاسلام، د. عبدالله ناصح علوان، دار السلام.

# سەرگوزەشتەی دووەم

# کچێکی تەمەن (١٤) ساڵی خەڵکێکی زۆر لەسەر دەستی موسڵمان دەبن

بانگەوازی بچکۆلە ئەفنان سەرگوزەشتەیەکی واقیعی پەروەردەیی کاریگەر، کچێکی سعوودی تەمەن (١٤) ساڵ خەڵکێکی زۆر لەسەر دەستی موسڵمان بوون، فەرموون با پێکەوە ئاشنا ببین و دۆعای خێری بۆ بکەین، دایکی ئەفنان ئەڵێت: کاتێك من حاملە بووم بە کچەکەم (ئەفنان)ەوە، باوکم خەوی بینی لە خەویدا چەند چۆلەکەیەکی بچووکی بینی بە ئاسماندا دەفڕین، و لە نێوانیاندا کۆترێکی سپی زۆر جوانکیلە دەفڕێ، بەرەو دوور فری و بۆ ترۆپکی ئاسمان بەرزبوویەوە، پرسیارم سەبارەت بە لێکدانەوەو تەفسیری خەوەکە لە باوکم کرد، پێی وتم: ئەو چۆلەکانە منداڵی منن، و پاش ماوەیەکی تر کچێکی لە خواترسم دەبێت، قسەکەی تەواو نەکرد، منیش پرسیارم لێ نەکرد لە بارەی لێکدانەوەی ئەو خەوەوە، دواتر کچەکەم (ئەفنان) لە دایك بوو، لە ڕاستیدا کچێکی لە خوا ترس بوو، شوێنەواری ئافرەتی ساڵح و چاکم تێدا بەدی دەکرد، لە ساتە وەختی منداڵیدا بە هیچ شێوەیەك پانتۆڵ و جل و بەرگی تەسکی لەبەر نەدەکرد، زۆر بە توندیش ڕەتی دەکردەوە ئەگەر چی ئەو هێشتا منداڵ و بچکۆڵە بوو، کاتێکیش چووە پۆلی چوارەمی سەرەتایی بە تەواوەتی لە هەموو ئەو شتانە دوورکەوتەوە کە دەبوونە مایەی خەشم و قین و تووڕەیی خوا، ئامادە نەبوو بچێت بۆ نادی و هۆڵی شایی و خۆشی، تەنانەت ئەگەر شاییەکە هی کەسێکی زۆر نزیکیش بوایە، زۆر هۆگر و پەیوەست بوو بە ئاینیەکەیەوە و پێ داگری لەسەر دەکرد و زۆر بە جۆش و خرۆش بوو بۆی، پارێزگاری لە نوێژە فەرز و سوننەتەکانی دەکرد، بانگەواز کردن بۆ لای خودا کاتێك (ئەفنان) گەیشتە قۆناغی ناوەندی دەستی کرد بە کارو پرۆژەکانی لە بانگەوازکردن بۆ لای خوا، هەرکات خراپەیەکی ببینایە بە توندی ڕێگری لێدەکرد، پارێزگاری لە حیجاب و باڵا پۆشیەکەی دەکردو پێوەی پابەند بوو، ئەگەر چی هێشتا لەسەری واجب نەبوو بوو، سەرەتای بانگەوازکردنی بۆ لای خوا یەکەم کەس لەسەر دەستی موسڵمان بوو، خزمەت کارە سریلانکیەکەمان بوو، دایکی ئەفنان دەڵێت: کاتێك کوڕە بچکۆلەکەم (عبدالله) بوو لەبەر

ئەوەی فەرمانبەر بووم، ناچار بووم خزمەتکارێك بگرم بۆ ئەوەی لە ساتە وەختی لـە مـاڵ نەبووەنمدا گرنگی بدات بە کوڕەکەم، ئەو خزمەت کارەش ئافرەتێکی نەسڕانی بـوو، پـاش ئەوەی ئەفنان زانی کە خزمەت کارەکە موسڵمان نیە، تـووڕە بـوو وتـی: ناکرێـت و نابێـت کەسێکی نەسڕانی خزمەتی من بکات، منیش لەبەر ئەوەی زۆر پێویستیم بـەو خزمـەتکارە هەبوو هیچ گرنگیەکم بە قسەکانی نەدا، تەنها پاش دوو مـانگ، خزمەتکارەکـە هاتـە لام و زۆر دڵخۆش و بە کەیف بوو وتی: دایە من ڕزگارم بوو، ئـەفنان فێـری ئیـسلامی کـردووم و من شایەتی دەدەم و دەڵێم: (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله) منیش زۆر دڵخۆش بووم بەو هەواڵە، ئەفنان تووشی ئێشی قاچ هاتبوو، بەڵام ئەو ئێش و ئازارەی لـە ئێمە دەشاردەوەو دەیوت: ئازارێکی سادە لە قاچـم دایـە، پـاش دوو مـانگ شـەلەل بـوو، کاتێـك پرسـیارمان لـێ دەکـرد، دەیـوت: ئـازارێکی سـادەیەو (إنـشاءالله) نامێنێـت، دوای مانگێك تەواو پەکی کەوت و لە ڕۆیشتن کەوت و نەیدەتوانی بڕوات، لە ژووری نەخۆشـخانە دکتۆرێکی تورکی و وەرگێرێك و سستەرێکمان لەگەڵ بوو، دکتۆرەکە پـێ ی وتـین: قاچـی تووشـی شـێرپەنجە بـووە، سـێ دەرزی کیمیـاوی دەدرێـتێ، بـەڵام دوایـی مـووی سـەر و برۆکانی بەتـەواوی دەڕوێتـەوە، مـن و بـاوکی و مـامی کاتێـك هەواڵەکـەمان بیست توشـی شڵەژان و حەپەسان و شـۆك هـاتین، دانیـشتین و زۆر بـەتاس وبـە کـوڵ دەگریـاین، بـەڵام ئـەفنان هـەردوو دەسـتی خـستبووە سـەردەمی و زۆر دڵخۆشـبوو دەیـوت: ((الحمـد لله، الحمـدلله، الحمـدلله)) نـزیکم کـردەوە لـەخۆم وباوەشـم پیـاکردو لـەئامێزم گـرت، بـەدەم گریانەوە پێم وت: ئەفنان چیتە؟ ئەویش وتی: دایکە سوپاس بۆ خوا موسیبەتەکە لەخۆم دایە نەك لە ئاینەکەمدا، بـەدەنگی بـەرز هـاواری دەکـردو سوپاسگوزاری خـوای دەکـردو دەیوت: سوپاس بۆ خوا هـەموانیش بـەو پـەڕی سەرسـامی و سەرسوڕمانەوە تەماشـایان دەکردو لێیان دەڕوانی، منیش خۆم زۆر بەبچوك هاتـە پـێش چـاو، کاتێـك چـاوم بـە کـچە بچکۆلەکەم و باوەڕە بەرزەکەی کەوت، هەڵوێستەکەی زۆر کاریگەر بوو لە دڵمان، دکتـۆرو وەرگێرو سستەرەکە کاتێك ئاستی باوەڕی بەرزی ئـەفنانیان بـینی دەسـتبەجێ موسـڵمان بـوون، جـا پـێش ئـەوەی ئـەفنان دەسـت بکـات بـە چارەسـەر بـە بـەکارهێنانی دەرزی کیمیاوی، مامی داوای لێکرد کە سەر تاشێکی بۆ ئامادە بکەن تا قژی ببڕێت پێش ئـەوەی بە چارەسەرەکە هەڵبوەرێت، بەڵام ئەو زۆر بـە تونـدی بەرپرچـی دایـەوە و ڕەتیکـردەوە، هەوڵمدا قەناعەتی پێبکەم، و خواستی مامی جێبـەجێ بکـات، بـەڵام ئـەو ڕازی نـەدەبوو و

دەیوت: من نامەوێت بێ بەش بم لە پاداشتی هەر تاڵە قژێکی سەرم کە هەڵدەوەرێت، منو هاوسەرەکەم و ئەفنان بە یەکەم فڕۆکە بەڕێکەوتین بۆ ئـەمریکا بـە مەبەسـتی چارەسـەر کردنی ئەفنان، کاتێك گەیشتینە ئەوێ، دکتـۆرێکی ئەمـەریکی ئـافرەت، کـە مـاوەی (١٥) ساڵ لە سعودیە کاری کردبوو، هەندێ وشەی عەرەبی بە باشی دەزانی، و چـاو پێکـەوتنی لەگەڵ کردین، کاتێك ئەفنان ئەوی بینی پرسیاری لێکرد: ئایا تۆ موسڵمانیت؟

ئەویش وتی: نەخێر.. ئەفنان لەگەڵ خـۆی بـردی بـۆ یـەکێك لـە ژوورەکـان و لەگەڵیـدا دانیشت و دەستی کرد بە بانگکردنی بۆ ئیسلام، دکتۆرەکـە هـات بـۆ لام و چـاوەکانی پـڕ ببوون لە ئەسرین و فرمێسك وتـی: مـن مـاوەی (١٥) سـاڵە لـە سعودەیەم، کـەس بـانگی نەکردوم بۆ ئیسلام، کەچی ئێستا ئەو کچە بـچکۆڵە هـاتووە، و دوای موسـڵمان بـوونم لـێ دەکات، ئەوە منیش بڕیارمدا کە لەسەر دەستی موسڵمان ببم، لـە ئـەمریکا پێیـان وتـین: هیچ چارەسەرێکی نیـە تـەنها ئـەوە نـەبێت قاچی ببڕینـەوە بـۆ ئـەوەی شـێر پـەنجەکـەی نەگاتە سیەکانی و بیکوژێت، ئەفنان نەدەترسا لـەوەی کـە قاچـی ببڕێتـەوە، بـەڵکو ئـەو خەمی دایك و باوکی هـەبوو، ڕۆژێـك لـە ڕۆژان ئـەفنان لـە ڕێگـەی (ماسـنجەر)ەوە قسـەی لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانی دەکرد بە ناوی (ڕانیا) و پرسیاری لێدەکرد، ئەفنان وتـی: ڕات چۆنە ڕێگەیان پێ بدەم قاچم ببڕنەوە (ڕانیا) هەوڵیدا دڵنیـاو ئـارامی بکاتـەوە و پێـی وت: دەتوانن قاچێکی بە دیلت بۆ دابنێن، بـەڵام ئـەفنان وەڵامـی دایـەوە بـە تـەنها وشـەیەك و وتی: من غەمی قاچم نیە، بـەڵکو تـەنها هیـواو ئـاواتی مـن ئەوەیـە کاتێـك خستمیانە نـاو گۆڕەوە بە بڕواوە بچمە ناویەوە، ڕانیا دەڵێت: پاش وەڵامەکـەی ئـەفنان هەسـتم کـرد کـە من لەبەرامبەر ئەودا بچکۆڵەم و لە هیچ تێناگەم، من هەموو بیرو ئەندێشەم لای ئەوەیە لـە داهاتوودا چۆن دەژی، بـەڵام بیرکردنـەوەی ئـەو زۆر لـەوە بـەرزو بـاڵاترە، ئـەو بـیر لـەوە دەکاتەوە کە چۆن دەمرێـت، دایکی دەڵێـت: پـاش ئـەوەی قاچـی (ئـەفنان)مـان بڕیـەوە گەڕاینەوە و بۆ (ریاض)، بەڵام ئـەوەی کتـوپڕ بـوو شـێرپەنجە گەیشتە سیەکانی، ئیـدی حاڵەتەکەی زۆر نائومێدانە بوو، بە جۆرێك لەسـەر جێگـە دایاننـابوو کـە بـە تەنیشتیەوە دوگمەیـەك هـەبوو، تـەنها بـە دەسـتنان بـە دوگمەکـەدا دەرزیـەکی سـڕکەر و دەرزیـەکی موغەزی دەهاتە خوارەوە بۆ سەری، لە نەخۆشخانە دەنگی بانگ نەدەبیستراو ئـەفنانیش لە حاڵەتێکی بێ ئاگاییدا بوو، بەڵام تەنها بە هاتنی کاتی نوێژ یەکسەر دەهاتـەوە هـۆش خۆی بەبێ ئەوەی کەس خەبەری بکاتەوە و بـە ئاگای بهێنێتـەوە، داوای ئـاوی دەکـرد و

دەستنوێژی دەگرت و نوێژی دەکرد، پزیشکەکان پێیان وتین: مانەوەی لە نەخۆشخانە هیچ سوود و کەڵکێکی نیەو تەنها ڕۆژێك یا دوو ڕۆژی ماوە و ژیان بە جێدێڵی، ڕۆژێك خێزانی مامەی هات بۆ سەردانی و منیش پێم وت: لە ژوورەوە نوستوە، کاتێك چووە ژوورەوە شڵەژاو حەپەساو پاشان دەرگاکەی داخست، ترسام لەوەی (ئەفنان) شتێکی بەسەر هاتبێ، خۆم پێنەگیراو چووم بۆ لای، دەرگای ژوورەکەم کردەوەو ڕاچڵەکیم و سەرسام بووم، چیم دی؟ گڵۆپەکان کوژاونەتەوەو دەم وچاوی (ئەفنان)یش لەنێوەندی ئەو تاریکیەدا بریسکی دێت و دەدرەوشێتەوە، منی بینی و زەردەخە گرتی و وتی: دایکە وەرە خەوێکم بینیوە بۆت بگێڕمەوە، منیش ووتم: خێر دەبێ (إنشاءالله) وتی: لە خەومدا بینیم من بووکم و لە ڕۆژی گواستنەوەدام و کراسێکی سپی گەورەم پۆشیبوو، تۆ و ماڵەوە هەمووتان لە دەورم بوون، هەموویان دڵخۆش بوون بە شووکردنەکەم تەنها تۆ نەبێت ئەی دایکە، پرسیارم لێکرد گومان دەبەیت لێکدانەوەی خەوەکەت چی بێت؟ وتی: هەست دەکەم کە دەمرم هەموویان لە بیرم دەکەن و دەچن بەلای کاری خۆیانەوەو بە ئاسوودەیی و خۆشیەوە ژیانی خۆیان دەگوزەرێنن، تەنها تۆ نەبێت ئەی دایکە، بەردەوام یادم دەکەیت و غەم و خەفەت بۆ جیابوونەوەو دوورکەوتنەوەم دەخۆیت.

ئەفنان ڕاستی وت: من ئێستاکە چیرۆکەکە دەگێڕمەوە لە ناخمەوە دەکوڵێم و دەسوتێم، هەرکاتێکیش بیری لێدەکەمەوە غەمبار دەبم و بۆی خەفەتی بۆ دەخۆم، کۆتایی بەختەوەری ڕۆژێك لە ڕۆژان لە نزیك ئەفنان دانیشتبووم، من و دایکم بووین ئەفنانیش لەسەر جێگەکەی پاڵیدابویەوە، لە پڕ خەبەری بوویەوە، و وتی: دایکە نزیك بەرەوە لێم دەمەوێت ماچت بکەم، ماچی کردم و پاشان وتی: دەمەوێت لاکەی تری ڕوومەتیشت ماچ بکەم، منیش لێی نزیك بوومەوە و ماچی کردم، دواتر گەڕایەوە سەر جێگاکەی پاڵکەوت و دواتر ڕویکردە قیبلە و وتی: (أشهد أن لا إله إلا الله) تا (١٠) جار دووبارەی کردەوە پاشان وتی: (أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله) پاشان گیانی دەرچوو گەرایەوە بۆ لای پەروەردگاری خۆی بۆنی میسك پاش وەفاتی و مردنی ئەو ژوورەی کە تێیدا مردو کۆچی دوایی کرد، تا ماوەی (٤) ڕۆژ بۆن و بەرامەی میسکی لێ دەهات.[1]

---

١ـ گۆڤاری چرای ڕووناکی ، گۆڤارێکی مانگانەی ئایینی کۆمەڵایەتی ڕۆشنبیری گشتی یە ، ژمار (٦)٢٠٠٩.

# سەرگوزەشتەی سێیەم

# ڕۆڵە شیرینەکەم

خوێنـەری بـەڕێز: ئـەم چـیرۆکەی بۆتـانی ئەگێڕمـەوە ڕاسـتەقینەیەو زۆر کاریگـەرە، (ڕاشید) خۆی بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت: تەمەنم لە(٢٠) ساڵی تێنەپـەڕیبوو، کـە یەکـەم کۆرپەمان بوو، بەردەوام ئەو شەوەم لە یادە.

لە دەرەوە لەگەڵ کۆمەڵـە برادەرێـك دانیـشتبووین، کـۆڕی ئـەو شـەوەمان پـڕ بـوو لـە قسەی بێ سوودو غەیبەت و گاڵتە کردن بە یەکتری، زۆرجار من جڵەوی کۆڕەکەم دەگرتـە دەست کە ئەوانم بە پێکەنین دەهێنا، ئەوانیش پێ دەکەنین بە قسەکانم.

لە یادمە ئەو شەوە زۆریـانم بـە پێکـەنین هێنـا، چـونکە مـن زۆر بـە جـوانی دەمتـوانی لاسایی خەڵکی بکەمەوە بەجۆرێك، کە دەنگی خۆم دەگۆڕی وەکـو دەنگـی ئـەو کابرایـەم لێدەکرد، کە گاڵتەم پێ دەکرد.

بـەڵێ.. بـەو شـێوەیە گاڵتـەم بـەو دەکـرد بـەو دەکـرد کـەس لـە برادەراکـانم ڕزگـاری نەدەبوو.. لە یادمە کە ئـەو شـەوە گاڵتـەم بەکابرایـەکی کـوێر کـرد، کوێرەکـە لـە بـازاڕدا دەڕۆیشت، منیش پێم خستە سەر پێی ئەویش سـاتمەی کـردو بـەدەما کـەوت، منـیش لـە قاقای پێکەنینمدا بەجۆرێك کە خەڵکی هەموو سەیریان دەکردم.

کەچی کوێرە داماوەکە ئاهێکی قوڵی هەڵکێشا و سەری داخست و هەندێ چرپـە چـرپی کرد، بەڵام من نەمزانی چی وت: پاشان هەروەکو جاران بە کاتێکی درەنگ چوومەوە ماڵ، بینیم واخێزانەکەم چاوەڕوانم دەکات، دیار بوو حاڵی زۆر شپرزە بوو، بـە پەرۆشـەوە پێـی وتم: لە کوێ بویت؟

منیش بەگاڵتەوە پێم وت: لە سەر مەریخ بووم، خـۆ دیـارە لـە لای برادەرەکـانم بـووم، بەڵام دیار بوو زۆر شەکەت بوو، بۆیە پێی وتم: (ڕاشید) من زۆر شپرزەم کاتی منـاڵ بـوونم نزیك بوەتەوە، بینیم فرمێسك لە چاوەکانی دێتە خوار.

هەستم کرد خێزانەکەم فەرامۆش کردوە، لە مەودوا دەبێت زوو بێمـەوە، و ئاگـام لێـی بێت، بە تایبەت کە ئێستا سکی لە مانگی نۆیەمی دایە.

کە زانیم زۆر شپرزەیە بە پەلـە بـردم بـۆ نەخۆشـخانە، بردمـە ژووری لـە دایـك بـوون و دەستم کرد بەچاوەڕوانی، بەڵام دیار بوو منداڵ بوونەکە تاخیر دەبـوو، منـیش ئارامیـەکی وام نەبوو چاوەڕوان بم، بۆیە ژمـارەی تەلەفۆنەکـەم جێ هێـشت تـاکو ئەگـەر شـتێك بـوو مژدەم پێبدەن.

بەڵێ.. کاتێ چوومەوە ماڵ پشویەکمدا دوای کاتژمێرێك لـە نەخۆشـخانەوە تەلـەفۆنیان بۆ کـردم، و وتیـان: خێزانەکـەت کـوڕێکی بـووە، منـیش بەپەلـە ڕۆیـشتم بـۆ بینـینی ئـەو کوڕەی، کە بڕیارماندا بوو ئەگەر ببێت ناوی لێبنێین (جاسم).

بەڕاستی بەپەلە گەیـشتمە نەخۆشـخانە، سـەیارەکەم بەپەلـە ڕاگـرت و بـەرەو پرسـگە ڕۆیشتم، و وتم: خێزانەکەم لە کام ژووردایە؟

بەڵام ئەوان وتیان: بڕۆ بۆ لای ئـەو پزیـشکە ئافرەتـەی، کـە سەرپەرشـتی خێزانەکـەت دەکات، هاوارم کرد کام پزیشك؟

من دەمەوێت (جاسم) ببینم وتیان: سەرەتا بڕۆ بۆ لای پزیشکی سەرپەرشتیار.

منیش چوومە لای پزیشکەکە، پزیشکەکەش بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردم و پێـی وتم: دانیشە، منیش دانیشتم باسی تاقیکردنـەوەی خـوداو موصـیبەتی بـۆ دەکـردم، کـە مـرۆڤ شتێکی بەسەر هات دەبێت بە قەدەری خوا ڕازی بێت، نابێت ناشوکر بێت.

پاشان پێـی وتم: ئـەو کـوڕەی کـە خێزانەکـەت بویـەتی نەخۆشـی لەچـاوەکانیدا هەیـە لەوانەیە چاوی لە دەست بدات.

بەڵێ.. هەواڵێکی زۆر ناخۆش بوو، بۆیە بـە دامـاوی دەسـتم لـەژێر سـەرم دانـا خـەیاڵ بردمیەوە لە ناکاو ئەو پیاوە کوێرەم بیرکەوتەوە، کە بەر پێنـەم دایـەو بـەریۆوەو دۆعـای لێکردم، مرۆڤ چ بچینیت ئەو دەدورێتەوە.

بەم شێوەیە بە داماوی مامەوە نەمزانی چی بلێم، هەرچۆن بێت سوپاسی پزیـشکەکەم کردو ڕۆیشتم بۆ بینینی خێزانەکـەم، بینـیم خێزانەکـەم سوپاسـی خـوای دەکـرد، چونکە باوەڕی پتەو بوو بە قەدەری خوا.

خێزانەکەم بەردەوام ئامۆژگاری دەکردم، کە واز بێنم لە گاڵتە کردن بە خەڵکی و دەیوت: کوڕە بەسە ئەوەندە سەرزەنشت و گاڵتە بەخەڵکی مەکە.

بەهەرحاڵ لە نەخۆشخانە دەرچووین، و(جاسم)یشمان لەگەڵ دابوو، چووینەوە بۆ ماڵ.

بەراستی من زۆر بایەخم بەو کوڕە نەدەدا بە جۆرێك کە وام دادەنا هەر لە ماڵیش نیە، هەر کاتێکیش بگریایا ئەوێم بەجێ دەهێشت دەچوومە هۆڵەکە دەخەوتم، بەلاَم خێزانەکەم زۆر بایەخی پێ دەدا، و زۆریشی خۆش دەویست، من ڕقم لێی نەدەبۆوە، بەلاَم خۆشیشم نەدەویست.

(جاسم) کە نزیکی ساڵێك بوو زۆر بە سەیری کاگۆڵەی دەکرد، پاشان کە دەیویست لەسەر پێ بڕوات، بۆمان دەرکەوت، کە گۆجیشە، بۆیە زیاتر لەسەر دڵم گران بوو.

وێڕای (جاسم) خێزانەکەم دوو کوڕی تریشی هەبوو(عمر) و (خالد)ساڵ هات و ڕۆیشت (جاسم)و براکانی گەورە بوون، من هەرگیز حەزم نەدەکرد لەماڵ دانیشم، بەردەوام لەگەڵ هاوڕێکانم لە دەرەوە بووم، لە ڕاستیدا من وەکو تۆپێك وابووم، کە هاوڕێکانم یاریان پێ دەکردم، بەلاَم خێزانەکەم هەرگیز بێ ئومێد نەدەبوو لە ئامۆژگاری کردنم کە بەردەوام داوای هیدایەتی بۆ لە خوا دەکردم، هەرگیز لە کارە قێزەوەنەکانم تووڕە نەدەبوو، بەلاَم زۆر دڵتەنگ دەبوو کە دەیبینی (جاسم)م بەلاوە ناوە و بایەخ بە براکانی دەدەم.

بەڵێ.. (جاسم) گەورە بوو غەمی منیش لەگەڵیدا گەورە بوو، خێزانەکەم لە بنکەی کەم ئەندامان ناوی (جاسم)ی تۆمارکرد منیش ڕێگر نەبووم لەو کارەی هەستم بە ڕۆیشتنی ساڵ و مانگ و ڕۆژ نەدەکرد، ڕۆژەکانم بریتی بوو لە کار و خەو و خواردن.

ڕۆژی هەینی بوو، کە گۆڕان لە ژیانی مندا ڕویدا کاتژمێر (١١)ی بەیانی بوو لە خەو هەڵسام، ئەو ڕۆژە بانگهێشت کرا بووم بۆ زەماوەندێك، و خۆم گۆڕی و خۆم بۆن خۆش کرد، دەمویست بڕۆم لە ڕۆیشتندا بە تەنیشت هۆڵەکەماندا ڕۆیشتم دیمەنی (جاسم) هەڵوەستەیەکی پێکردم بینیم وا بە کوڵ دەگریێت.

منیش زۆر بەلامەوە سەیر بوو ئەوە یەکەم جارە ببینم (جاسم) ئاوا بە کوڵ بگریێت، ئەوە (١٠) ساڵە لە تەمەنی (جاسم) تێپەڕیوە ئاوڕم لێی نەداوەتەوە، ویستم خۆم لە گێلی

بدەم، بەڵام نەمتوانی، چونکە دەمبیست بانگی دایکی دەکات کەچی من لەوێ بووم بانگی منی نەدەکرد.

منیش لێی نزیك بوومەوە و وتم: (جاسم) ئەوە بۆ دەگری؟

کاتێك گوێی لە دەنگم بوو گریانەکەی ڕاگرت و هەڵوەستەیەکی کرد، کە هەستی کرد وا لە تەنیشتیم بە دەستە بچووکەکانی دەیویست بزانێت لە کوێمەو، دەبێت چی بکات؟

بۆم دەرکەوت، کە دەیەوێت لـێم دوور بکەوێتـەوە، وەکـو ئـەوە وابـوو بـە زمـانی حـاڵ بڵێت: ئێستا هەست دەکەی کوڕێکت هەیە بـە (جاسـم) ئـەی ئـەو(١٠) سـاڵەی ڕابـردوو لـە کوێ بوویت؟

بــەڵێ.. وردە وردە ڕۆیــشت و چــووە ژوورەکــەی خــۆی وتم: جاسـم چـی بـووە بـۆ دەگریەیت؟

سەرەتا لەبەر گریان ڕەتیکردەوە پێم بڵێت، پاشان بە نەرمی هەوڵمدا هۆی گریانەکەی ڕوون بکاتەوە، (جاسم) هۆی گریانەکەی بۆ ڕوون دەکردمـەوەو منـیش گـوێم بـۆ گرتبـوو، دەزانن بۆ دەگریا؟ هەموو کـات (عمـر)ی بـرای دەیـبرد بـۆ مزگـەوت، بـەڵام ئـەمڕۆ (عمـر) دواکەوتووە، چونکە نوێژی هەینیەو دوادەکەوێت لە ڕیزی یەکەم شـوێنی چـنگ ناکـەوێت، بۆیە بانگی (عمر)ی دەکرد وەڵامی نەبوو.

بانگی دایکی دەکرد کەس نەبوو وەڵامی بداتەوە بۆیە ئەویش دەستی دەکرد بە گریان.

بینـیم فرمێـسك لـە چـاوەکانی جۆگەڵـەی کـردوە، بۆیـە نـەمتوانی گـوێ بـۆ قـسەکانی ڕابگرمو دەستم لەسەر دەمی دانا و وتم (جاسم) بۆ ئەوە دەگریەیت؟

وتی: بەڵێ..

چونکە ئەو گریانەی (جاسم)م وەکو تەزووی کارەبا هەموو جەستەمی داگرتبـوو، بۆیـە هاوڕێکانم و دەعوەتەکەم لە بیر چۆوە.

وتم: (جاسم) خەفەت مەخۆ دەزانی ئەمڕۆ کێ دەتبات بۆ مزگەوت؟ وتی: بەڵێ.. (عمر) دەمبات بۆ مزگەوت، بەڵام (عمر) بەردەوام دوا دەکەوێت.

وتم: نەخێر بەڵکو ئەمڕۆ من بۆ خۆم دەتبەم بۆ مزگەوت.

(جاسم) سەرسام بوو بڕوای نەدەکرد، وای دەزانـی گاڵتـەی پـێ دەکـەم، لـە خۆشـیان دەستی کرد بەگریان، منیش چاوەکانیم سڕیەوە دەستیم گرت و ویستم بەسەیارەی ببەم، بەڵام ئەو ڕەتی کردەوە بەسەیارە بڕوات وتی: بابـەگیان دیـارە نـازانی مزگـەوت لێمانـەوە نزیکە، بەپیادە دەڕۆین بۆ مزگەوت، بەڵێ.. بەرەو مزگەوت چـووین، کـە چـوومە ژوورەوە هەستم بە ترس و پەشیمانی دەکرد، بینیم مزگـەوت پـڕە لـە خـەڵك، بەهـەرحاڵ لـە ڕێـزی یەکەم بۆ(جاسم) شـوێنێکم بینیـەوە، دانیـشتین و گوێمـان بـۆ وتـاری هـەینی گـرت، دوای تەواوبوونی نوێـژی هـەینی(جاسـم) داوای لێکـردم قورئـانێکی بـۆ بهێـنم، منـیش زۆرم پـێ سەیربوو، چۆن دەخوێنێتەوە خۆ ئەو کوێرە، ویستم خۆم لێی بێ ئاگا بکەم، بەڵام ترسام هەستی برینـدار بێـت، بۆیـە قورئـانێکم بـۆ هێنـا، داوای لێکـردم سـورەتی (الکهـف)ی بـۆ بکەمەوە، بەهەرحاڵ سورەتی(الکهف)م بـۆ بینیـەوە، قورئانەکـەی لـێ وەرگـرتم لـە پـێش خۆی داناو دەستی کرد بە خوێندنەوەی،(سـبحان الله) ئـەوە هـەموو سـورەتی (الکهـف)ی لەبەرە، ئاااه زۆر شەرمەزار بووم، هەڵسام قورئانێکم هێنا دەستمکرد بەخوێندنی، هەستم دەکرد تەزوو بە هەموو جەستەم دادێت، داوام لە خودا کرد لێم خۆشبێت و هیدایەتم بدات، خۆم پێ ڕانەگیرا وەکو منـداڵ دەسـتم کـرد بـە گریـان، هەنـدێ خـەڵك هێـشتا لەمزگـەوت مابوون نوێژی سونەتیان دەکرد، منیش لە شەرمەزاریا ویستم گریانەکەیان لێ بشارمەوە، بەڵام نەمتوانی بەڵکو گریانەکەم توندتر بوو.

زۆر خۆم بە شـەرمەزار دەزانـی لەبـەر گریـان ئاگـام لـە هـیچ نـەمابوو، هەسـتم دەکـرد (جاسم) بەدەستە بچکۆلەکانی چاوەکانم دەسڕێتەوە، بەشەرمەزاریەوە لـە باوەشـی خـۆم گرت و توند کوشیم، سەیرم کردو لەدڵی خۆمدا وتم: ڕۆڵـەگیان تـۆ کـوێر نیـت، بـەڵکو مـن کوێرم کاتێك ئەو هاوڕێیە سەر لێشێواوانە بەرەو ئاگریان دەبردم.

پاشان بەرەو ماڵ گەڕاینەوە، خێزانەکەم زۆر نیگەرانی (جاسم) بوو، بەڵام کە زانی مـن لەگەڵ (جاسم) چوومەتە نوێژی هەینی، نیگەرانیەکەی بوو بە گریانی خۆشی، لـەو ڕۆژەوە یەك نوێژم لە مزگەوت نەچوو، بەڵێ.. وازم لە دۆستە خراپەکانیشم هێنا، هاوڕێی چاکم بـۆ پەیدابوون، کە لە مزگەوت ناسیانم، ئەو کات لەگەڵ ئەواندا هەستم بە ئاسـودەیی دەکـردو تامی باوەڕم لـە دڵمـدا سـەری هەڵـدا، زۆر شتی چـاکیان لـێ فێـر بـووم، گـوێم لـە وتـاری مزگـەوت دەگـرت و نوێـژی (ویـترم) نەدەچـوو، لـە مانگێکـدا چـەندان جـار قورئـانم خـەتم

دەکـرد، بـەردەوام زمـانم تـەڕدەکرد بـەزیکری خـودا، داوا لـەخوا دەکـەم لـەو غەیبـەت و گاڵتانەی دەمکرد لێم خۆش بێت.

هەستم دەکرد لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانم تێکـەڵ بویمـەوە، خۆشـی و پێکـەنین گەڕایـەوە ناو ماڵمان، (جاسم) زۆر دڵخۆش بوو، سوپاسی خودام دەکرد لەسەر نیعمەتی هیدایەت.

ڕۆژێکیان هاوڕێکانم بڕیارياندا گەشـتێکی دوور بکـەن بەمنیـشیان وت: لەگـەڵیان بـڕۆم، منیش دوو دڵ بووم لە چوون، نوێژی (ئیستیخارە)م کردو پرسـم بـە خێزانەکـەم کـرد، وام دانابوو ڕەتی بکاتەوە، بەڵام زۆر خۆشحاڵ بوو، بەڵکو هانیشی دام، چونکە ئـەو دەیبـینی مـن پێـشتر دەڕۆیـشتم بـۆ شـوێنی خـراپ بـەبێ ئیزنـی ئـەو، ڕووم لـە جاسـم کـردو وتم: (جاسم)گیان وامن گەشت دەکەم ئەویش باوەشی پیا کردم و خوا حافیزی لێکردم.

بەڵێ.. سەفەرم کرد سێ مانگ و نیو لە ماڵ دوور کەوتمەوە، لەم ماوەیەدا پەیوەنیـدیم بەماڵەوە دەکرد، قسەم لەگەڵ خێزان و منداڵەکانم دەکرد، ئاااای! کە تامـەزرۆ بـووم گـوێ بیستی دەنگی جاسم بم، بەڵام بەداخەوە هەر کاتێ تەلەفۆنم بۆ ماڵەوە دەکرد(جاسم) یان لە قوتابخانە بوو، یان لەمزگـەوت، چـونکە لـەو کاتـەی سـەفەرم کردبـوو، تـەنها گـوێم لـە دەنگی ئەو نەدەبوو، زۆر تامەزرۆ بووم ئاواتم دەخواست گوێم لە دەنگی بێت.

هەموو جارێك کـە تەلـەفۆنم بـۆ خێزانەکـەم دەکـرد دەمـوت: بەڕاسـتی زۆر تامـەزرۆی (جاسم) بومەو زۆر غەریبی دەکەم، خێزانەکەشم، کـە گـوێی لـەم قـسەیە دەبـوو زۆر پێـی خۆش بوو دەیوت: (جاسم) زۆر باشە کە هاتیـەوە دەیبـینی، بـەڵام دواجـار کـە تەلـەفۆنم کرد، هەستم کرد خێزانەکەم دەنگی گۆڕاوەو پێکەنینی نەماوە.

دوای ئەوەی قسەم لەگەڵیدا تەواو بوو پێم وت: سەلام لە جاسم بکە، وتـی: (إنشاءالله) پاشـان بـێ دەنـگ بـوو، بـەڵێ.. کاتێـك کارەکانمـان تـەواو بـوو، بـەرەو مـاڵ گەڕاینـەوە، هاتمەوە پێش دەرگای خۆمان، سوپاس بۆ تۆ خوایە گیان، کە گەڕامەوە ئێستا پـڕ بـەدڵ (جاسم) لە باوەش دەگرم، ئێستا(جاسم) بزانێت من لەبەر دەرگام دەبێـت چـەند دڵخـۆش بێت، جا دەستم بەرز کردەوەو لە دەرگامدا، خۆزگەم دەخواست(جاسم) بێت دەرگـام لـێ بکاتەوە، بەڵام کە دەرگـا کرایـەوە بینـیم (خالیـد)ی کوڕمـە کـە تەمـەنی(٤) سـاڵان بـوو، منیش لە باوەشم گرت و هەڵمگرت، بابە هاتەوە بابە هاتەوە.

کە چوومەوە ماڵ نازانم بۆچی (أعوذ بالله)م کـرد، خێزانەکـەم بـەرەو ڕووم هـات بینـیم ڕەنگی گۆڕاوە، کەچی وای پیشان دەدا کە هیچ نیەو دڵخۆشە، پێم وت: ئـەوە چیە؟ چـی ڕوویـداوە؟ وتـی: هـیچ نیـە، ئەوکاتـە(جاسـم)م بیرکەوتـەوە وتم: ئـەی کـوانێ (جاسـم)؟ خێزانەکەم سەری داگرت و بێ دەنگ بـوو، بینـیم فرمێـسك بەچـاوەکانی دێتـە خـوارەوە، هاوارم کرد، کوا جاسم، کوا جاسم؟

هیچ وەڵام نەبوو، بەڵام کە(خالید)ی کـوڕم گـوێی لـێ بـوو، وتـی: بابـە گیـان (جاسـم) چووە بەهەشت چووە لای خوا، خێزانەکەم کە گوێی لەم قـسانە بـوو خـۆی پـێ ڕانـەگیراو دەستی بە گریان کرد، منیش بەسەر دەستا کەوتم لە پڕمەی گریانمدا، ئاااه (جاسم) گیـان چەند تامەزرۆ بووم کە دیسان لە باوەشم بگرتبای (إنا لله وإنا إليه راجعون)، پاشـان زانـیم دوو هەفتە پێش هاتنەوەم (جاسم) تووشی تایەکی قـوڕس هـاتبوو، خێزانەکـەم بردبوویـە نەخۆشخانە، بەڵام تاکەی زۆر توند بووەو بەری نەداوە، پاشان بەم تایە گیانی لە دەست داوە، بەڵێ.. بەم شێوەیە ڕێحانەی ژیانم وەفاتی کرد، زۆر شـەرمەزار بـووم، کـە سـەرەتا باش نەبووم لەگەڵیدا، کەچی هەر بە فەزڵی ئەو بوو خودا هیدایەتی دام.

بۆیە پێتان دەڵێم: جیـاوازی مەکـەن لەگـەڵ منداڵـەکانتان، ئەگـەر خـودا تاقیکردنـەوە بەمنداڵێکی وا یا شتێکی تر ئەوە ئارامی لەسەر بگرن و شوکرانەی خوا بکـەن و ناشـوکری مەکەن[1].

(١) (ڕۆڵە شیرینەکەم، فەرمان عزیز نجار)

# سەرگوزەشتەی چوارەم

# پێشەوا مالیك و منداڵێك

ڕۆژێك پێشەوا مالیك لە منـداڵێك نزیـك دەبێتـەوە، کـە یـاری بـە خـۆڵ دەکـات، جارێـك دەگریەت و جارێك پێدەکەنێت، لەگەڵ نەفسی خـۆی دەدوێـت، پێـشەوا مالیـك لێـی نزیـك دەبێتەوە لە دڵی خۆیدا دەڵێت: سەلامی لێ بکەم یان نا، بۆچی سەلامی لێ بکەم؟ نا.. با سەلامی لێبکەم چونکە پێغەمبەر(ﷺ) سلاوی لە منالان کردوە، جا لە منالەکە نزیك بۆوە، وتی: (السلام علـیکم ورحمـة الله وبرکاتـه) منداڵەکـەش وتـی: (وعلـیکم الـسلام ورحمـة الله وبرکاته) پێشەوا مالیك.

پێشەوا مالیك سەری سوڕما وتی: ئەی منـاڵ چـۆن دەزانیـت مـن مـالیکم؟[1] منداڵەکـەش وتـی: چـۆن نـازانم، پێـشەوا مالیـك وتـی: دیـارە تـۆ زۆر زیتـەڵ و زیرەکیـت، پرسـیارێکت ئاراستە دەکەم، منداڵەکە وتی: فەرموو، پێشەوا مالیك فەرموی: جیاوازی نێوان نـەفس و عـەقڵ چـیە؟ منداڵەکـە وتـی: نـەفس نەیهێـشت سـەلام بکـەیت، بـەلام عـەقڵ قەناعـەتی پێکـردیو زانیـت سـوننەتە سـەلام کـردن، کەواتـە هەرچـی بـە گـوێی نـەفس بکـات خەسارەتمەند دەبێت، پێشەوا مالیك فەرموی: باشە بۆ یاری بە خۆڵ دەکـەیت؟ منداڵەکـە وتی: لەم خۆڵە دروست بووین و بۆ ئەم خۆڵـەش دەگەڕێینـەوە، پێـشەوا مالیـك فـەرموی: باشە بۆچی دەگریەیت و بۆچی پێدەکەنیت؟ منداڵەکە وتی: چونکە دەترسم خوای گـەورە بمخاتە ئاگری دۆزەخەوە لەبەر گوناهەکانم، هەر کاتێ بیر لە دڵ و دەروونی بە پێزو خۆش بەختی خوای گەورە دەکەمەوە شاد دەبم.

پێشەوا مالیك وتی: باشە خۆ تۆ منداڵیت و پاك و بێگەردی بۆچی دەترسـی؟ منداڵەکـە وتی: چونکە هـەموو جارێك چاوم لێیـە کـاتێ دایکم ئـاگر دەکاتـەوە بـە داری گـەورە، و پاشان بەچیلکە، و داری بچووك ئاگرەکە خۆش دەکات تا بـە تـەواوی گـڕ دەگرێـت، بۆیـە منیش دەترسم بە ئێمە ئاگری دۆزەخ گەرم بکرێت.[2]

---

[1]ـ ئەم پیـاوە بـەڕێزە یەکێکـە لـە زانایـانی سـەردەمی خـۆی و یەکێکیـشە لـە پێـشەوایانی سـەر مەزهـەب (خـوای پەروەردگار لە هەموویان ڕازی بێت)

[2] ـ ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم، کۆکردنەوەی ئاوات ئەبوبەکر ئەحمەد، چاپی دووەم ٢٠٠٥ .

# سەرگوزەشتەی پێنجەم

## ڕۆژی بەدر

(عبدالرحمن ی کوڕی عوف) دەڵێت: لە ڕۆژی بەدردا لە ڕیزی سوپادا وەستا بـووم، کـە ڕوانیم، لە لای ڕاستم و چەپمدا دوو گەنج وەستاون، وەکو ئەوەی بەشیاویان نەزانم (لەبـەر منداڵی)، یەکێکیان بەنهێنی، بۆ ئەوەی بهێڵێ هاوەڵەکـەی ئاگـادار بـێ وتـی: مامـە گیـان ئەبوجەهلم پیـشان بـدە، منـیش وتم: ئـەبو جـەهلت بۆچـیە؟ وتـی: هـەواڵم پێدراوە، کـە جنێوی بە پێغەمبەری خـوا داوە، وتـی: بـەو خوایـەی کـە گیـانی مـنی بەدەسـتە، ئەگـەر بیبینـم نـاهێڵم سـێبەرمان جیـا بێتـەوە، هـەتا یـەکێکمان ئـەویتر نـەکوژێ، منـیش بەمـە سەرسـام بـووم، دەڵێـت: ئـەوی تـریش دەسـتی تێژەنـدم و هــەمان هەڵوێـستی نوانـد، ئەوەندەی پێ نەچوو سەیرم کرد دەبینم ئەبو جەهل لەناو خەڵکەکەدا هات وچۆ دەکـات، وتم: نابینن؟ ئەوە ئەو پیاوەیە ئێوە هەواڵی دەپرسن.

دەڵێت: بەشمشێرەکانیانەوە هەڵمـەتیان دایە سـەری هـەتا کوشـتیان، پاشـان چـوونە خزمەت پێغەمبەری خـوا(ﷺ)، پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرموی: (أیکمـا قتلـه)؟ واتـە: کامتـان کوشتتان؟ هەریەکەیان دەیـوت: مـن کوشـتم، فـەرموی: (هـل مـسحتما سـیفیکما)؟ واتـە: شمشێرەکانتان سڕیون؟ وتیـان: نـەخێر، ئـەمجا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) سـەیری هـەردوو شمشێرەکەی کـرد، فـەرمووی: (کلاکمـا قتلـه) واتـە: هـەردووکتان کوشـتووتانە، ئـەو دوو منداڵــەش (موعــاذی کــوڕی عــەمری کــوڕی جــەمموح(رضي الله عنه) و مووعــەوەذی کــوڕی عافوڕاء)بوون، سەرەنجام پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەلوپەلە دەستکەوتەکەی ئـەبو جەهلیـدا بە (موعاذی کوڕی عەمری کوڕی جەمموح)، چونکە مووعەوەذ هەر لەو جەنگەدا بـە پلـەی شەهیدی گەیشت.

ئیبنو ئیسحاق دەڵێـت: (موعـاذی کـوڕی عـەمری کـوڕی جـەمموح) دەی وت: گـوێم لـە خەڵکی بوو، ئەبو جەهلیش وەك لەناو دارستانێکی چڕدا بێـت و دەوری درابـێ، دەیـانوت: کەس دەستی ناگاتە ئەبولحەکەم، کە ئەمەم بیست، خستمە ئەستۆی خۆمـەوە، و بـەرەو

ڕووی ڕۆیشتم، کە لێی نزیك کەوتمەوە، هەڵمەتم دایە سەری و شمشێرێکم لێدا، و نیوەی قاچیم قرتاند و پەڕی، دە بە خوا کاتێك کە پەڕی بەو ناوکەم شوبهاند، کە لە ژێر دەسکەواندا دەردەپەڕێ دەی وت: عیکرەمەی کوڕی شمشێرێکیدا لەسەر شانم و قۆڵمی پەڕاند، و تەنها بە پێستێکی لاتەنیشتمەوەم هەڵواسرا بوو، و جەنگ و کوشتار ئەوی لە بیر بردبوومەوە، سەرانسەری ئەو ڕۆژەم خەریکی جەنگ و کوشتار بووم، و قۆڵەکەشم بە دوای خۆمدا ڕادەکێشا کە ئازاری دام، پێم خستە سەری و خۆم بە سەریدادا و فڕێمدا، پاشان کە ئەبو جەهل بەزامدارییی کەوتبوو (موعەوەذ)یش دای بە لای داو بە شمشێرێك لە جووڵەی خست، و لەگیان کێشدا بوو بەجێی هێشت، (موعەوەذ)یش خەریکی کوشتار بوو هەتا شەهید بوو، بەڵام (موعاذی کوڕی عەمری کوڕی جەمموح) هەتا سەردەمی خەلیفە عوسمان ژیانی بردە سەر.[١]

---

١ـ السیره النبویه د.علی محمد محمد الصلابی، دار ابن کپیر دمشق- بیروت الگبعه الرابعه ١٤٢٧ھ ٢٠٠٦ م.

# سەرگوزەشتەی شەشەم

## یادگاری لاویتی

دەمێـك بـوو بـاوکم ئـاڵودەی (شـەڕاب و مـەی) خواردنـەوە بـوو وەك خویـەك هـەردوو براکانیشمی فێر کردبوون، کە لەتەمەندا لەمن گەورەتر بوون، دایکم مێژی زۆر بەجوانی بۆ دەڕازاندنەوە، خزمەتی باشی دەکردن، گەر شەوێك وەك پێویست کاریـان بـۆ نـەکات ئـەوا دایکم ڕووبـەڕووی هەڕەشـەو قـسەی ناخۆشـی بـاوکم دەبۆوە، یـان بـەکارتی(تـەڵاق دان) ئاگاداردەکرایـەوە، لـە گـەرەك زۆر جـار سەرزەنەشـت دەکـراین، دەنگمـان دەڕۆیـشتە دەرەوەی ماڵ، منیش بەو کردارەی ماڵەوەمان زۆر دڵگران بووم چەندین جار هەوڵمدا بوو، بێ سودبوو، دایکم زۆر منی خۆش دەویست بە پێچەوانەی باوکمەوە، براکانیشم خۆشـیان دەویستم، بەڵام کە باسی حەرام و حەلاڵم لەلایان دەکرد تووڕە دەبوون، زۆر جار باوکم بە خواپەرستی من سەرسام دەبوو کە گەنجم و بـۆ خـوا دەژیـم و بـە فـەرمانی کاردەکـەم، و وەك ئەوان نیم لە کارو کردەوەدا، جوان لە یادمـە شـەوێك زۆرم بـرا گەورەکـەم هانـدا کـە وازبهێنێ وتم: (کاکە) دەزانیت ئـەم ئـارەق خواردنـەوەیـە چـەند خراپـە لـە ڕووی مـاددی و مەعنەوی خێرت دەگات دووركەرەوە لێی، مەی چارەسەری زامـەکانتان نیـە، بـەڵام گـوێی پێنەدا کارتێکەر نەبوو لە ناخیان سادە بوو، بۆیـە دەی وت: دیـنی خـۆت بـۆ خـۆت دیـنی خۆم بۆ خۆم، لە یادم نەچێت مـن بـچوکترین ئەنـدام بـووم لەبـەر ئـەوە هەنـدێك نـەرمیان دەنواند بەرامبەرم.

قوتابی قۆناغی دواناوەندی بوم جار جارەش چاوم لە دەسـتی بـاوکم بـوو بـۆ خـەرجی قوتابخانەو پێداویستیەکانم، خوا دایکم ڕوو سپی بکات زۆرجار بەنهێنی باوکمـەوە دەسـت گیرۆی دەکردم.

شەوێکی زستان زۆر سارد بوو، چونکە شەوی پێشتر بەفرێکی زۆر بارییوو ئەمـشەویش ساردییەکەی بێ ئەندازە بوو، لەپەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد، کلوە بەفر ووردە ووردە دەبوونە میوانی سەر زەوی، ئای ئای، کە جـوانن " لـە دەمـە دەمـی خـەوتنـدا بـوو

چوومە ژوورەکەی بـاوکم و براکـانم ئـەوان سـەر گـەرمی ئـارەق خواردنـەوە بـوون، و دوور لەخوا دەژیان، تەسجیلیان کردبۆوە منیش بە دەنگێکی نەرم و نەوی بانگی بـاوکمم کـرد، بابە گیان بابە گیان! حـەز دەکـەم ئاگـات لـێم بێـت، بـاوکم کـە بتڵـە ئارەقەکـەی لەسـەر مێزەکە دانا بوو ئاوڕێکی بەلای مندا دایەوەو وتی: ها شەوشێت چیتە؟ خەوت دیوە؟ یـان ئێمە دەخۆینەوەو تۆی گرتووە؟ بێزارمان مەکە دەڵێی چی؟ وتم: بابە گیـان! ببـورە لـەم کاتە ناشایستەیەدا هاتمە ژوورەوە حەزم دەکرد کاتێکی تر بوایە، بەڵام کەی تۆ کاتـت بـۆ پیاچوونەوەو گرفتـەکانی ئێمـە تـەرخان کـردووە، ناچـارم کاتـت لـێ بگرم بڵـێم: ئەگـەر ماڵەکەمان ئاگری تێبەربێت بسوتێت تۆ چی دەکەیت، هـاوارو ڕاکـەڕاك بـۆ بـەرو دراوسـێ، کەچی برا گەروەکەم دەنگی بەرز کردەوە وتـی: نـا بابـە وازی لێبێنـە کـە ماڵەکـە سـووتا ئەمیشی تێدەخەین و نەجاتمان دەبێت، باوکم وتی: ڕۆڵە لاچۆ وازمان لێبێنە ئاگری چـی و شتی چی، هەستم بەشەق پارچە پارچەت دەکەم خۆتم پـێ بە کوشت مەدە؟

براکەی ترم تا ئەو کاتە پەرداخەکەی هیچی تیا نەمابوو وتی: ئێمە سـەرگەرم دەکـەین یا شەڕ دەکەین دەبا هەر بڵێ کاکم دەیەوێت ئێمە دوور خاتەوە لە شەڕاب، بەڵام ناتوانێت ناشیەوێت هاو مێز و هاودەرمان بێت، دەوازی لێبێنن، وتم: ڕاسـت دەکـەن، بـەڵام دەبێـت یان من بم ئەمشەو یان ئێوە؟

باوکم! زۆر قسەی پـێ وتم و دەری کردمە دەرەوە، وتم: بابە گیان! پێم ناخۆشە بـەڵام با ئامۆژگاریەکانم یادگاری بێت لەلات، بەڵام بـێ سوود بـوو، ئـەوانیش پاڵیـان پێوەنـام تـا دەرگای دەرێ کاتێکم زانی بەرچاوم لێڵ و تاریك بوو، ناو دەمم تامی سـوێری پێگەیـشت، بـە دەمـا کـەوتم بەئاسـتەم گـوێم لـێ بـوو لـە دەنگـی دەرگاکـە، کـە بـە تونـدی لەسـەری داخستمو چووە ژوورەوە، کە سـەیرم کـرد خـوێنێکی بـاش لـە دەم و دەسـتم ڕۆیـشتبوو، چەند ملیمەترێك بەفریش لەسەر پشتم بـاری بـوو، لـە ئاکامـدا بـۆم دەرکـەوت دەسـتم بـە دەرگاکەوە بووە و شەقێکیش لە لاشەو ویلگەم هەڵدراوە، ئیتر لە هۆش خۆم چـوو بـووم، بەو حاڵەوە ڕازی نەبووم، بۆیە وتم: خوایە گیان! ئـەمـە تاکـەی وا دەژیـن، خوایـە گیـان! دڵیان نەرم ببێت، دەستم بـۆ ئاسمـان بـەرز کـرد تـا لـە تواناما بـوو لـە خـوای میهرەبـان پاڕامەوە، زۆر سەرمام بوو هەڵدەزریم، لەپی دەستـەکانم بـەفراوی دەبـوون، ئـەمجا زانـیم نیوەی شەوە هەر لەناو بەفرەکە ڕووم لە قیبلە کردو دوو ڕکات نوێژم کرد، دوای نوێژەکـە

وتەی ئەو پیاو چاکەم بیر کەوتەوە کە دەیفەرموو: (زستان بەهاری خواناسانە)، چونکە ڕۆژگارەکانی گەرمەو خواناسی تیا دەکات کە ڕۆژووی سوننەتە، منیش بە بەرگی خوێناویەوە نوێژەکەم ئەنجامدا، بەبەڵگەی ئەوەی کە پێشەوا عومەر(ﷺ) کاتێ خەنجەرەکەی لێدرا بە جلە خوێناویەکەیەوە نوێژی کرد، هەروەها پێشەوا ئەحمەد بە بەرگی خوێناویەوە نوێژو خواپەرستی ئەنجام دەدا لە بەندیخانەدا، چونکە ناچار بوون، منیش ناچار بووم، جا لەگەڵ تەواو بووندا هەر چیم لە پاڕانەوەو نزا زانی دەستم کردە خوێندنی نازانم فرمێسکی خۆشی بوو یان ناخۆشی لە زۆربەی پاڕانەوەکانمدا ئەم ئایەتە پیرۆزەم دووبارە دەکردەوە ﴿ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ﴾ سورة إبراهيم: (٤١).

واتە: ئەی پەروەردگارمان لەمن و باوکم و دایکم و هەموو بڕواداران ببورەو خۆش ببە، لە ڕۆژێکدا کە لێپرسینەوە دەکرێ و ڕۆژی دوایی بەرپا دەبێ.

ئەنجا بەدەم گریانەوە زۆر دۆعام بۆ باوکم و براکانم دەکرد، هەرچەندە زۆر هیلاك بووم، بەڵام لە ناخەوە لەسەرەتای خۆش گوزەرانیدا بووم، لە یادم نەچێت قسەیەکی پیاو چاکێکم بیرکەوتەوە کە دەیفەرموو: (خوای گەورە لە نێوان بانگی مەغریب و عیشادا کارەکان ئاسان دەکات و دەیگەیەنێتە ئامانجی خۆی)، بەڵام من داوای چاکسازی زۆر خێرام دەکرد کە دەفەرموێ: (کن فیکون) لە نێوان پیتی(ك) و پیتی(ن)دا ماوەیەکی زۆر کەم هەیە، دەمویست لەو ماوە کەمەدا خوای گەورە پاڕانەوەکەم گیرا بکات.

کاتێکم زانی دەنگی دەرگاکە هاتە بەر گوێم کرایەوە، پاش چەند هەنسکێك لە قوڵپی گریان هەستم بە بیستنی گریان کرد، بەڵام لەناخ و دڵما هەر دۆعام دەکردو بەردەوام بووم، هەستم کرد دەستێکی گەرم ڕوویەکی گەرم و تەڕ لە پەنا گوێچکەم کەوت، جوان هەستم کرد کە ئەمە یەکێکە، بەڵام وام هەست نەکردو بۆی نەچووم کە باوکم بێت، وتم: ڕەنگە دایکم بێت، چونکە ئەوەندەی دایك بە سۆزە، باوك وانیە، بەبیرم هات کە باوکم و براکانم نوستوون دایکیشم ئاگری جگەر هەڵی گرتووە، و دەیەوێت بمباتە ژوورەوە، بەڵام بڕیارمدا بوو کە ئیتر نەگەڕێمەوە ئەو ماڵە تا بڕیاری چاك و گەڕانەوە نەدەن بۆ لای

بەرنامەی خوا، دەڕۆم کارێك دەکەم، زەوی خوا فرەوانە کەس پەکی ناکەوێت، بەڵام من ڕزگار بوونی خێزانەکەم مەبەست بوو نەك ژیانی خۆم.

خۆشەویستان ئەوەی بۆی دەچووم وانەبوو هەستم بە(درییەك) کرد کە لە ڕوومەتم خشا، کە ڕیش بوو ئیتر بۆم دەرکەوت کە ئەمە باوکمە، دەگری ئاگر لە جەرگی بەربووە، خوای پەروەردگاریش پاڕانەوەکانی گیرا کردبووم.

جا بە دەنگێکی نەرم و پڕ لە گریانەوە وتی: هەستە، هەستە ڕۆڵەگیان! ئێمە زۆر خەراپەمان کرد دەرهەق بەتۆ، بەڵام تو ئەو خوایەی لێی دەپاڕێیتەوە دڵی منی گۆڕی، لێمان ببورە، کە وای وت: نەمزانی چۆن باوکم لە باوەش کردو دامە گریانێکی قوڵ، وتم: بابەگیان! بۆ هاتیتەر دەرەوە بەم شەوە ساردو بەفراویە.

باوکم کە تا ئەو کات نەمدیبوو بگری بەدەم گریانەوە وتی: ڕۆڵە گیان! خۆشم نازانم بڕوا بکە نازانم هێزێك ناخی هەژاندم و پالی پێوەنام، پاشان نەمزانی تۆ لێرە ماویت ئەگینا زووتر دەهاتم بە دواتا با بڕۆینەوە ژوورەوە، بەڵام من وتم: نە بابەگیان! تازە من بڕیاری کۆتایی خۆم داوە، دۆعاشم بۆ کردون کە خوای گەورە قفڵی دڵەکانتان بە کلیلی هیدایەت بکاتەوە، من دەڕۆم تا ئێوە وەهابن، من نایەمەوە ئەو ماڵە.

هێزم دایە بەر خۆم کە هەستم بەڵام قاچەکانم سڕ بوون لە دوام نەهاتن بەرز بوومەوە و کەوتم، بەڵام باوکم کە ئەو خوێنەی بینی وتی: بەڵێن بێت تۆ چی دەڵێیت ئێمە وادەکەین، بەڵێن بێت بۆ خوا بژین، چونکە خوای گەورە تۆی سەرخست و ئێمەش دەمانەوێت لەگەڵ تۆ بین، وتم: (بابە گیان هەر قسەم ناوێت کردەوەم دەوێت، بەڵێنم پێ دەدەیت) باوکیشم وتی: لەجیاتی جارێك سەدجار بەڵێن بێت، ئەوسا بڕوام کرد، سوجدەیەکی شوکرم بۆ خوای پەروەردگار برد، هەر لەوێ بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ ماڵ بەهێزی باوکم ئەمجا باڵی گرتم و چووینە ماڵەوە لە پڕ دایکم هات بەرەو پیرم باوەشی پیا گرتم گووشیمی بە خۆیەوە، تا ئەو کاتەش هەستم بە خۆشەویستی دایکم و گەرمی باوەشی و خەم ڕەوێنی هەناسەی نەکردبوو، باوکیشم هاواری کردو وتی: لەم ساتەوە یەك کەس بۆی نیە لە ماڵی مندا بێ شەرعی بکات دەبێت هەمووتان بۆ خوا بژین.

جا لەو شەوەوە ماڵی ئێمە بووە ماڵێکی زۆر جوان و جیاواز لە شەوەکانی تر، ئای تامو چێژی ئەم ئاینە چەند شیرینە بڕیارمدا ئەو ئایەتە پیرۆزە لە لای خۆشنووسێك

بنووسـم کـە خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ آل عمران: ١٩.

واتە: بێگومان تەنها ئەم دینی ئیسلامەیە، پەسندو قبوڵـە لای خـوا، چـونکە پاڵاوتـەو پوختەی تەواوی ئایینە ئاسمانییەکانی ترە، ئەوانـەش کـە کتێـب و نامـەیان پێدرا"واتـە: جوولەکەو گاور" کە لەناو خۆیاندا پێك نـەهاتن و لەهـەق لایانـدا، هـەر پـاش ئـەوەبوو کـە بەڵگەو زانیاریی تەواویان بـۆ هـات دەربـارەی ڕاسـتی ئـەو ئایینـەی کـە موحەمـەد(ﷺ) هێنای، ئەویش هەر لەبەر عینادی و حەسوودییەك بوو لەناویاندا هەبوو، چونکە دەیـانزانی بەهاتنی دینی ئیسلام، سەرۆکایەتی ئەوان لە کیس دەچێت، بۆیە لـە باوەڕهێنـان بـەدینی ئیسلام کلابوون و بوو بەهەراو کێشەیان! ! دەسا دڵنیابن هەرکەسێك باوەڕی بـە ئایـەت و نیشانەکانی خوا نەبێت، با چاك بزانن کە خـوا لـە ڕۆژی لێپرسـینەوەدا، بـە چەسـپانی بـە حیسابیان ڕادەگا.[1]

---

١ـ تەفسیری ڕامان لەماناو مەبەستی قورئان، ئەحمەد کاکە محمود، لا ٩٧ – ٩٨. ئەسرینەکانی سـەدەی بیسـتەم، کۆکردنەوەی ئاوات ئەبوبەکر ئەحمەد، لاپەڕە ٦٩ .

# سەرگوزەشتەی حەوتەم

# کەڕو لاڵێکی تێگەیشتوو

ئەو سەرگوزەشتەیە یەکێکە لە سەرگوزەشتە سەرسوڕهێنەرەکان، ئەگەر خاوەنەکەی نەی نوسیبوایە باوەڕم نەدەکرد کە ڕوویدابێ.

خاوەنی سەرگوزەشتەکە دەڵێت: من گەنجێکم تەمەنم(٢٧) ساڵەو خاوەن خێزان و منداڵم، هەرچی تاوانی گەورە هەیە ئەنجامم داوە، نوێژم بە کۆمەڵ نەدەکرد مەگەر لە بۆنەکاندا نەبێ بۆ خەڵەتاندنی خەڵکی، هۆیەکەشی برادەری خراپ و بەدکار بوو، زۆربەی کاتەکان شەیتان لەگەڵم بوو.

کوڕێکم هەبوو تەمەنی(٧) ساڵ بوو ناوی(مەڕوان)بوو کەڕو لاڵ بوو، بەڵام بە شیری دایکە باوەڕدارەکەی گەورە ببوو، شەوێك لە شەوان من و مەڕوانی کوڕم لە ماڵەوە بووین، بیرم دەکردەوە نەخشە دابنێم کە لەگەڵ هاوڕێکانم چی بکەم و بچینە کوێ، کاتەکەش پاش بانگی ڕۆژئاوابوو، لەم کاتەدا (مەڕوان) قسەی بۆ دەکردم و دەیوت: بابەگیان! بۆ نوێژ ناکەیت؟[1]

ئەمجا دەستی بەرز دەکردەوە بەرەو ئاسمان هەڕەشەی لێدەکردم کە خودا دەمبینێ، چونکە هەندێك جار بە چاوی خۆی دەیدیت کە خراپەم دەکرد، لە قسەکەی سەرم سوڕما لەپێشم دەستی بە گریان کرد، منیش بردمە لای خۆم بەڵام هەڵات، پاش کەمێك دەست نوێژێکی جوانی شوشت، بەڵام چاك نەیدەزانی، ئەو دایکەی فێری کردبوو زۆر ئامۆژگاری دەکردم، و سوودی نەبوو، قورئانی لەبەر بوو کوڕەکەم هاتەوە لام، ئاماژەی بۆ کردم کە کەمێك چاوەڕێ بکەم دیتم دەستی بە نوێژ کرد، پاشان چوو قورئانی هێناو لە پێشم دایناو کردیەوە، بەبێ ئەوەی لاپەڕەکانی وەربگێڕێ، یەکسەر پەنجەی لەسەر ئەم ئایەتەی سورەتی (مەریەم) دانا کە خوای باڵادەست ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَبَتِ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَـٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَـٰنِ وَلِيًّا﴾ (مريم : ٤٥)، واتە: ئەی باوکی خۆشەویستم

١ـ بەو هێمایەی بەینی خۆمان کە تێگ دەگەیشتین.

بـە ڕاسـتی دەترسـم (گـەر بـەکافری بمـری)، تووشـی سـزایەك بـبی لەلایـەن خـوای بـە بەزەییەوە، ئیتر ببیتە هاوڕێ و هاودەمی شەیتان (لە دۆزەخدا).

ئەمجا دەستی بە گریان کرد، منیش لەگەڵ ئەو دەستم بە گریـان کـرد، پاشـان هەسـتا فرمێسکی چاومی سڕیەوە، ئەمجا سەرو دەستی ماچ کردم، بەئاماژە پێی وتم: بابـەگیان! نوێژ بکە پێش ئەوەی بچیتە ناو خاك و خۆڵ و بکەویتە ناو سزاوە.

منیش زۆر ترسام و یەکسەر هەستامەوە گڵۆپەکانم پێکرد، (مەروان)یش بە دوامدا بوو، هۆدە بەهۆدە سەیری دەکردم و وتی: واز لە ڕووناکی بێنـە بـابڕۆین بـۆ مزگـەوتی گـەورە (مەبەسـتی مزگـەوتی پێغەمبـەر بـووﷺمنـیش وتم: نـا دەچـینە مزگەوتەکـەی لای مـاڵی خۆمان، ئەویش وتی: نـەخێر دەبـێ بـچینە مزگـەوتی پێغەمبـەرﷺ، ئـەمجا بردمـە ئـەوێ منیش لە ترسێکی زۆر گەورە دابووم و چاوی قەت لەسەرم هەڵنەدەگرت.

پاشان چوومە ناو (ڕەوزەی پیرۆز) کە پڕ بوو لە خەڵك نوێژی شێوانیان دەست پێکرد، پاشان پێش نوێژەکە دەستی بەنوێژ کردو لە دوای خوێندنی سورەتی (فاتیحە) ئەم ئایەتەی خوێند کە خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾. (سورة النور، الآية: (٢١).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بـەدوای نەخـشەو هـەنگاوەکانی شـەیتان مـەڕۆن، واتە: گوێ مەگرن بە درۆو بوهتان کردن بـە بـڕواداران، چـونکە ئـەوەش لـە هـەنگاوەکانی شەیتانە، هەر کەسێك شوێنی هەنگاو، و پیلانەکانی شەیتان بکەوێ، دیارە ئـەوە دوچـاری کـاری ناپەسـندو ناشـیاو دەبێـت، چـونکە بێگومـان شـەیتان هەمیـشە فـەرمان بـەکاری ناپەسندو قێزەوەن دەکات، خۆ ئەگـەر فـەزل و میهرەبـانی خـوا نەبوایـە لەسـەرتان یـەك کەسـتان هـەرگیز لـە گونـاه پـاك نەدەبویـەوە، واتـە: ئەگـەر ئـەو ڕێنمـونی نەکردنایـە بـۆ پەشیمان بوونەوە قەت ڕێتان دەرنەدەکرد، بەڵام بەزەیی خوای میهرەبان زۆرە، بۆیـە بـۆ هەر کەسێ خۆی حەزبکاو بیەوێ شایستە بێت، لە گوناهـەکانی پـاکی دەکاتـەوە، چـونکە

خوا زۆر ژنەوایە بە وتەو کردارتان، زۆر زانایشە بەهەموو نیازو نیەتێکتان، جا کەواتە پەلە بکەن و پەشیمان ببنەوەو دەست لە بوختان کردن هەڵبگرن[1].

باوەڕتـــان هێنـــاوە بـــە دوای هـــەنگاوەکانی شـــەیتاندا مـــەڕۆن، وە هەرکـــەس شـــوێن هەنگاوەکانی شـەیتان بکـەوێ، چونکە بەڕاستی شـەیتان فـەرمان دەکات بـە کـاری زۆر ناشیرن (زینـا)و خراپـە، ئەگـەر بـەهرەو میهرەبـانی خـوا نەبوایـە بەسـەرتانەوە، هـەرگیز کەسێ لە ئێوە پوخت و پاك نـەدەبۆوە، بـەڵام خـوا هـەر کەسـی بـوێ (شـیاو بـێ) پـاکی دەکاتەوە، وە خوا بیسەرو زانایە.

منیش خۆم پێ ڕانەگیرا لە گریان و (مەڕوان)یش لە تەنیشتمەوە بە گریانی من دەگریا، لە کاتی نوێژیشدا (مـەڕوان) دەسـتە سـڕێکی دەرهێنـاو فرمێسکەکانمی پـێ دەسـڕیەوە، پاش ئەوەی کە نوێژیش تەواو بوو هەر دەگریام و ئەویش فرمێسکی دەسڕیمەوە، نزیکەی کاتژمێرێك لەوێ ماینەوە هەتا مـەڕوان وتـی: باوکـە گیـان! مەترسـێ تـەواو بـوو، چـونکە (مەڕوان) زۆر دەترسا لەبەر گریانی بە کوڵی من.. پاشان گەڕاینەوە مـاڵ، و ئـەو شـەوەی کە ئێمەش تیای بووین پیرۆزترین شەوی ژیانی من بوو، چونکە وام ئـەزانی تـازە لـە دایـك بوومە، ئەمجا خێزانەکەم لە خۆشی ئەو هەواڵـە خـەریك بـوو بفـڕێ کـە ئـەو منداڵـە بـەری پەروەردە جوانەکەیەتی، پاشان سەرگوزەشتەکەم بۆ خێزانەکـەم گێڕایـەوە کەچـی ڕووی دابوو، پاشان وتم: بە خێزانەکەم سوێندت دەدەم بە خوا ئایا تۆ فێرت کردبوو کە قورئـان بکاتەوە، و دەست لەسەر ئەم ئایەتە دابنێ؟

خێزانەکەشم (٣) جار سوێندی خوارد کە ئەو فێری نەکردووە، پاشـان وتـی: سوپاسـی خوا دەکەم لەسەر ڕێنمایی تۆ.

ئەو شەوە خۆشترین شەوی ژیانم بوو، سوپاس بۆ خـوا نوێـژەکانم هـەمووی بەکۆمەڵـە لەمزگـەوت، هاوڕێیـە خراپەکانیـشم وازم لێیـان هێنـا، و تـامی بـاوەڕم چەشـت، و ئەگـەر بمبینی لەڕوخسارم ئەمـە بـەدی دەکـەی کـەوا ئێـستا لـە ژیانێکی پـڕ لـە بەختـەوەری و خۆشەویـستی دامـــە، ئێـستاش خێزانەکـــەم و منداڵـــەکانم لـــە هـــەموو شـــتێك لـــە لام خۆشەویـسترن، بـە تایبـەتی (مـەڕوان)، چـونکە مـن لەسـەر دەسـتی ئـەو گەڕامـەوە نـاو باوەشی ئاینی پیرۆزی ئیسلام[2].

---

١ تەفسیری ڕامان لەماناو مەبەستی قورئان، ئەحمەد کاکە محمود، لا ٥٥٧، نەشری ئیحسان، چاپی یەکەم.

٢ـ قصص الهدایە، عمرو خالد، إعداد وتنسیق فوزیە جزبە ص ٣٧ .

# سەرگوزەشتەی هەشتەم

## ئەو چرایەی ژیانی ڕووناك کردمەوە

یەکێ لـە خۆشەویـستان ئـەم سەرگوزەشـتـەیەمان بـۆ ئەگێڕێتـەوەو دەڵێـت: کابرایـەك هەبوو لەناو شارێکی گەورەدا دەژیا، سوپاس بۆخوا لەهەر کوێ سەیرت بکردایـە(منـارەی مزگـەوت) بـوو، بـەڵام ئـەو کابرایـە هاموشـۆی مزگـەوتی نـەدەکرد، تـەنها بـۆ پرسـەو سەرەخۆشـی ئەچـوو بـۆ مزگـەوت، ئـەوە چـەند سـاڵێکە تـەنها سـوجدەیەکی بـۆ خـوا نەبردووە، بەڵام قەدەری خوای گەورە بەو شێوەیە بوو، کـە ئـەم کابرایـە لەسـەر دەسـتی کچە (پێنج) ساڵانەکەی ڕێنمایی وەربگرێت.

بەڵێ.. کچەکەی تەنها تـەمەنی(٥) ساڵ بوو، جا با لێی گەڕێین بزانین خۆی چۆن بـاس لە گەڕانەوەی خۆی بۆ پەیامی پیرۆزی ئیسلام دەکات، و دەڵێـت: شـەوانم لەگـەڵ هـاوڕێی خراپدا بەسەر دەبرد، خۆمان بەشتی خراپ و گوناه و تاوان خەریك کردبوو، ئەو هاوسـەرە بەوەفاو دڵسۆزەم بەتەنیا جێدەهێشت لـەماڵ، خۆشـم لەگـەڵ هـاوڕێی خـراپ و گوناهکـار تاوانمان ئەنجام دەدا، یەك تۆز هەستمان بە ئـازاری ویـژدانی مردومـان نـەدەکرد، خێـزانم زۆر بەنەرمی و بەگـەرمی و ڕووخۆشـی ئامۆژگـاری دەکـردم کـە واز لـەو هاوڕێیـە خراپانـە بهێنم، بەڵام من خۆم لێی نابیست کردبوو.

هێماکە سوورە، ڕێگاکە پڕە لە ئۆتۆمبێـل تـەنها چـەند دەقیقەیـەك مـاوە بـۆ وادەکـەم نـەفرەت لـەو هێمایـە چـەند درێـژە، خۆزگـەم لـە ڕێـزی یەکـەم بوومایـە ئێـستا بـەخێرا دەڕۆیشتم.

چرکەکان بە هێواشی تێدەپـەڕن، جـار جـارە هێماکـەی ترافیـك لایت دەبـووە ڕەنگـی سـەوز، دەسـتم داگـرت بەسـەر هـۆڕنی ئۆتۆمبێـل و گـشتیانم بێـزار کـرد، ئۆتۆمبێلـەکان جووڵانەوەو بەپێش یەکەم کەوتم، چی نەمابوو خۆم لە سەیارەکانی دووەم بـدەم سـەیارە لێخوڕینەکەم بووە مایەی ترسی دەورو بەرم، هەوڵمـدا خێراتـریم، بـەڵام نـەمتوانی چـونکە ئەوان ڕۆیشتبوون بۆ کوێ بچم؟ نەمزانی چ وەڵام بدەمەوە.

ئۆتۆمبێلەکـەم هێـواش دەڕوات دەسـتم کـرد بـە بیرکردنـەوە، تـا لەگـەڵ هـۆڕنی

ئۆتۆمبێلێکی تر بە ئاگا هاتمەوە هیچ ئاگام لە خۆ نەبوو، بڕیارمدا شەو لە ماڵ بەسەر بەرم، ئەوە بیرۆکەیەکی باشە کچە تاقانەکەم نەخۆشە، پێویستە لەنزیکی بم، ئۆتۆمبێلەکەم لە بەرامبەر دوکانێکی ڤیدیۆ وەستاند، ئەمجا چومە دوکانەکەو چەند فلیمێکم هەڵبژارد، پاشان بەرەو ماڵ بەڕێ کەوتم و گەیشتمە پێش دەرگاو دەرگای ماڵەکەم کردەوە، بانگی هاوسەرەکەم کرد تا چاو چەرەزاتم بۆ بهێنێت، ئەمجا منیش چوومە ژوورەکەی خۆم، پاشان خێزانەکەم بە چاو چەرەزاتەو هاتە ژوورەوە، بە ڕوومداو پێکەنی گوتی: دەڵێی لەگەڵ هاوڕێکانت بێزاربوویت، و دەتەوێت لە ماڵەوە دانیشیت، وتم: بەڵێ وەرە دانیشە دڵی زۆر خۆش بوو، ویستی دانیشێ هەڵسام بەرەو ئامێری ڤیدیۆ و تەلەفزیۆنەکە فلیمی خراپم ئیش پێکرد، پاشان خێزانەکەم پێی گوتم: لە خوا بترسە ئەحمەد گیان!.

ئەمجا بەحەسرەت و دڵشکاوی چۆوە دەرەوە، و دەستم کرد بەخواردنی چەرەزات و چاوەکانیشم لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن بوو، کاسیەتی یەکەم تەواو بوو، پاشان کاسیەتی دووەمم هاویشت سەر ڤیدیۆکە، کاتژمێر (٣)ی شەوە لەناکاو دەرگاکە بەهێواشی کرایەوە کچە نەخۆشەکەم هاتە ژوورەوە، منیش سەرم سوڕما تۆزێك بێ دەنگ بوو، هیچ قسەی نەکرد پاشان وتی: لە خوا بترسە باوکە گیان! لە خوا بترسە باوکە گیان! ئەمجا ڕۆیشتو دەرگاکەی داخست.

منیش بانگم کرد وەڵامی نەدامەوە، بە دوای کەوتم خەریك بوو بڕوا نەکەم، ئایا ئەوە کچەکەمە؟ کاتێ دەرگای ژوورەکەم کردەوە دیتم لە باوەشی دایکیدا نووستووە، ئەوە کچەکەمە.. پاشان گەڕامەوە ژوورەکەم و ئامێری ڤیدیۆکەم داخست، ژوورەکەم پڕ بوو بە دەنگی کچەکەم کە وتی: لە خوا بترسە باوکە گیان! لە خوا بترسە باوکە گیان! ترسێکی زۆر گیانی داگرتم هەموو گیانم بوو بە ئارەقە نەمدەزانی چیم لێ بەسەر هات؟

وشەکانی بەر بەستەکانی سەر دڵمی بڕی، ئەو بەربەستانەی کە دەمێکی زۆر بوو لەسەر دڵم بوون، وازهێنان لە نوێژ گوناه و تاوان جگەرە کێشان فلیمە بەد ڕەوشتیەکان.. هتد.

لەبێ ئاگایی هاتمەوە هۆش خۆم و لێدانی دڵم خێراتـر دەبـوو، هەوڵمدا بخـەوم بـەڵام نەمدەتوانی، کات زوو تێدەپەڕی بیرم هەر لای وشەکانی کچەکەم بوو کە پێی وتم.

لەو خەیاڵـەدا بـووم بـانگی بەیانیـدا، هەسـتەکانم جـوڵان و لـەرزینێك بـە گیانمـدا هـات (الصلاة خير من النوم) واتە: نوێژ خێرترە لە خەوتن.

ئـەمجا دەسـت نوێـژم هـەڵگرت و چـوومە مزگـەوت، و بەڕێگـەدا دەڕۆیـشتم وەك بلێـی نەیناسمەوە، شنەبای بەیانی گلەیی دەکرد تۆ لە کوێی؟ پاشان چـوومە نـاو مزگـەوت دوو ڕکات نوێژم کرد، پاشان دانیشتم دەستم کـرد بـە قورئـان خوێنـدن، هـەر چـەندە قورئـان خوێندنەکەم باش نەبوو، بەڵام هەستم دەکرد قورئان قسەم لەگەڵدا دەکات، ئارەزووم پـێ دەبەخشێ، دەرگای تەوبەو ڕزگاربوونم لە ئاگری دۆزەخ بۆ دەکاتەوە:

﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ (سورة الزمر : (٥٣).

واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) پێیان بڵێ: خوا دەفەموێت: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار کردووەو هەڵەتان زۆرە، نا ئومێد مەبن لەڕەحمەتی خوا، چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە ڕاست بکەن، خوا لە هەموو گوناه و هەڵەکانتان خۆش دەبێت، چونکە بێگومان ئەو خوایە زۆر لێخۆشبوو و لێبووردەیە زۆر بەسۆز و میهرەبانیشە.

دانیشتوانی ناو مزگەوتیش زۆر بەنامۆیی سەرنجیان ئەدام و بە لایانەوە سەیر بوو، کـێ هاتۆتە مزگەوت؟

پاش ئەوە پێش نوێژی مزگەوتەکە دەستی بەنوێژی بەیانی کرد، و منـیش لەگـەڵ ئـەو نوێژەدا دڵم زۆر خۆش بوو، دەستی کرد بەخوێندنی سـورەتی (فاتیحـە)و پـاش خوێنـدنی سورەی (فاتیحە) ئەم ئایەتەی خوێند کە خوای کردگار ئەفەرموێ: ﴿ألم يعلموا أن الله هو يقبل التوبة عن عباده ويأخذ الصدقات وأن الله هو التواب الرحيم﴾.

ناوچەوانم بۆ خوا خستە سەر زەوی و کڕنوشم بـرد، و خـۆم پـێ نـەگیرا و زۆر بـە کـوڵ گریام، ئەمویست نەگریم نوێژەکە بە ئاسایی بکـەم، بـەڵام خـۆم پێنـەگیرا ئەمـە یەکـەمین کڕنوش بوو لـە دوای (٧) سـاڵ بـۆ پـەروەردگار، ئـەم گریانـە بـووە مایـەی خێـر، چـونکە

هەرچی دووری و سارد و سڕی و تەمبەڵییەك هەستم پێ ئەكرد لەوەو پێش لەلام نەما، هەستم كرد خۆشەویستی خوا دڵ و دەروونی داگرتووم، حەزم نەدەكرد بڕۆم بۆ ماڵەوە، لە دوای تەواوبوونی نوێژو ویردەكان، پێش نوێژی مزگەوتەكە سەیرێكی كردم و بەخێرهاتنێكی گەرمی لێكردم، پاشان دەستی خستە سەر شانم و بەدەستی نەرمی فرمێسكەكانی سڕیم، و زۆر سەیری كردم، لەگەڵ وردبوونەوەمدا وام دەزانی منداڵێكی بچوكم و كەسێك ڕێنموییم دەكات، بەڵێنم بەخوای گەورەدا، كە تا لە ژیانی دونیادا مابم نوێژەكانم بەكۆمەڵ بكەم لە مزگەوت، و هەرگیز بۆ لای تاوان و هاوەڵی خراپ نەگەڕێمەوە.

ورده ورده گەڕامەوە ماڵ، بەڵام هەر چەندم كرد خەو نەچووە چاوەكانم، بۆیە خۆم پێچایەوەو چووم بۆ (فەرمانگە)، هاوڕێكانم زۆریان پێ سەیر بوو، چونكە من زۆربەی كات دوا دەكەوتم بە هۆی ئەوەی شەوان درەنگ دەخەوتم بە دیار سەتەلایتەوە.

هاوڕێیەكم هەبوو زۆر لەخوا ترس بوو، هەواڵەكەم بۆ گێڕایەوە چاوەكانی گەشانەوە، زۆر سوپاسی خوای كرد، و پێی وتم: سوپاسی خوای گەورە بكە، كە ئەو كچە بچكۆڵەیەی پێ بەخشیوی.

كاتێك نیوەڕۆ هات بەهۆی ئەوەی نەنوستبووم هیلاك بووم، كارەكانم بە هاوڕێیەك سپارد، منیش زۆر بە خێرایی بەرەو ماڵ گەڕامەوە، تا پشویەك بدەم و كیژە بچوكەكەم ماچ بكەم، و شتی بۆ بكڕم، چونكە ئەو بووە مایەی گەڕانەوەم بۆ لای خوا، كە گەیشتمەوە ماڵەوە هاوسەرەكەم بە گریانەوە پێشوازی لێكردم، منیش ترسام، و وتم: چی بووە؟ بۆ پەشۆكاوی و بۆ ئەگریت؟ وتی: كچەكەمان مردووە، منیش خەریك بوو بكەوم بەسەر زەویدا، و زۆر گریام، پاش ماوەیەك كە هاتمەوە هۆش خۆم چوومە سەر لاشەكەی، دەتگوت: ساتەكانی شەوە، گەرم و نەرم، چاوەكانی لەخەوێكی قوڵدا بوون، خێرا تەلەفۆنم بۆ هاوڕێكەم كرد، و ئەویش هات بۆلام، و پاش شوشتن و كفن كردن چووین بۆ سەر گۆڕستان و بە خاكمان سپارد.

ئەم منداڵە بووە مایەی ڕێنماییم و ڕێنیشاندەر بۆ من، پاشان ئەو برادەرە خۆشەویستو دڵسۆزە ئەو ئایەتەی خوێندەوە كە خوای باڵادەست ئەفەرموێ:

﴿التَّائِبُونَ الْعَابِدُونَ الْحَامِدُونَ السَّائِحُونَ الرَّاكِعُونَ السَّاجِدُونَ الْآمِرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّاهُونَ عَنِ الْمُنكَرِ وَالْحَافِظُونَ لِحُدُودِ اللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾. (سورة التوبة، الآية: (١١٢).

واتـە: (موجاهیـدان ئەمانـە سـیفەتیانە) تۆبـەکارن، خواپەرسـتن، سوپاسـگوزارن، گەشتیارن و کۆچەرن، کڕنوش بەرن، (نوێـژ خـوێنن)، فـەرمان دەرن بـە چاکەو بـەرگری کەرن لە خراپە، پارێزەرن بۆ سنورەکانی خوا، جا (ئـەی محمد(ﷺ) مـوژدە بدە بـەو باوەڕدارانەی (ئەو سیفەتانەیان تیایە)[١] .

١ـ پوختەی تەفسیری قورئان ئامادەکردنی مەلا محمد مە لاصالح لاپەڕە : ٢٠٥ .

# سەرگوزەشتەی نۆیەم

## مندالەکەم ڕێنمایی کردم

مامۆستا حسن موفتی یەکێ لە سەرگوزەشتەکانیدا دەڵێت: ڕۆژێکیان دەچووم بۆ گەڕەکی(شیخ محی الدین)، دەستم لە سەیارەیەك ڕاگرت، و ڕۆیشتین، کاکی شوفێر لەناو سەیارەکەدا وتی: مامۆستا گیان! زۆری ماوە بۆ مانگی ڕەمەزان؟

وتم: بۆ؟ وتی: هەر حەز ئەکەم بزانم.

وتم: (إنشاء الله) بە ڕۆژوو ئەبیت؟ وتی: بەڵێ.

وتم: ساڵی ڕابردوو چۆن بوویت لەگەڵ مانگی ڕەمەزان؟

وتی: مامۆستا گیان! ساڵی ڕابردوو زۆر خراپ بووم، بەڵام ئەمساڵ بڕیارم داوە زۆر زۆر باش بم.

وتم: چۆن؟ وتی: ساڵی ڕابردوو جەژنی ڕەمەزان خۆم ئەگۆڕی، کوڕێکی بچوکیشم هەبوو ئەویش خۆی ئەگۆڕی، وتی: بابە گیان! ئەوە بۆ خۆت ئەگۆڕی؟

وتم: ڕۆڵە گیان! ڕۆژی جەژنەو ئەچم بۆ جەژنانە.

وتی: بابە گیان! ئەمە جەژنی تۆ نیە؟ چونکە تۆ بەڕۆژوو نەبوویت، جەژنی ئەوانەیە کە مانگی ڕمەزان بە ڕۆژوودەبن.

منیش پشتێنەکەم بە دەستەوە بوو بۆ نەبەسترا، چۆکم داداو دانیشتم و زۆر بیرم لە قسەکەی دەکردەوە، چونکە قسەکەی کاریگەری زۆر بوو، ئەو منداڵە هەست ئەکات من هەست ناکەم، ئیتر بڕیارمدا لە دووەم ڕۆژی جەژنەوە بە ڕۆژوو بەم، و ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانم گێڕایەوە، سوپاس بۆ خوا ئەو منالەم بووە هۆی ڕێنماییم، بۆیە چاوەڕوانی مانگی ڕەمەزانم، ((مامۆستا حسن موفتی)) دەڵێت: بە قسەکانی دڵم زۆر گەشایەوەو دۆعای خێرم بۆ کرد[1].

---

١ـ ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم، کۆکردنەوەی: ئاوات ئەبوبەکر ئەحمەد، چاپی دووەم، ٢٠٠٥ز ـ ل١٥٠.

# سەرگوزەشتەی دەهەم

## موسڵمانبوونی قەشەیەك لە تەنزانیا

قەشەیەك لە تەنزانیا کوڕێکی (١٢)ساڵی دەبێت، ڕۆژێـك لـە بـاوکی دەپرسـێت: خـوای سپی پێست و ڕەش پێستەکان جیاوازە؟

باوکی دەڵێت: بۆچی ئەم پرسیارە دەکەیت؟

منداڵەکە دەڵـێ: چـونکە دەبیـنم ڕەش پێـست بـە جیـا دەچـنە کەنیـسەوە، تـا ئـەوان نەیەنە دەرەوە سپی پێستەکان ناچن.

ئـەمجا منداڵەکـە دەسـتی بـاوکی گـرت، و تـا مزگـەوتێکیان لـێ دەرکـەوت کـە نوێـژی هەینیان دەکرد، و هەموو ڕەگەزەکان بەبێ جیاوازی لـە مزگەوتـدا بـوون، منداڵەکـە وتـی: ئەوەتا لێرە هەموو یەك خوایان هەیە، بۆ ئێمەش تەنها ئەو خوایە نەپەرستین؟

باوکەکەش سەری سوڕما، نەیدەزانی چـی بکـات، چـونکە کوڕەکـەی پێـشتر موسـڵمان ببوو بەبێ ئەوەی باوکی بزانێت، ئەنجا منداڵەکە چووە مزگەوت، و زۆر پاڕایـەوە کـە خـوا ڕێنمایی باوکی بدات، خوای گەورەش نزاو پاڕانەوەکەی لێوەرگرت، و باوکیـشی موسـڵمان بوو[١].

١ـ ژیانەوە، ئەندازیار عوسمان موحەمەد، ڕەشید، ل٣٥٢.

# سەرگوزەشتەی یانزەهەم

## خزمەتکاری کچەکەی فیرعەون

ئەمە سەرگوزەشتەیەکی ئافرەتێکی باوەڕدارە، کە پێغەمبـەری ئازیزمـان محمـدﷺ لـە سەفەری ئیسراو میعراجدا لێی ئاگاداربوو، ئەو شەوەی کە بۆ ئاسمان بـەرز کرایـەوە، لـەو شەوەدا لە کاتی سەرکەوتنیدا بۆنێکی خۆشی بـۆن کـرد، ئەوەنـدەی بـەلاوە سـەیر بـوو، پرسیاری لە جبریل کرد کە ئەم بۆنە خۆشە لە کوێوە هات؟ جبریلیش هەواڵی دایە کە ئەم بۆنە لەو ئافرەتە باوەڕدارە، و منداڵەکانیەوە بەرز دەبێتەوە، کە شانەکەری قژی کچەکەی فیرعەون بووە.

ئەم ئافرەتە لە کۆشکی فیرعەوندا دەژیا، و کاری ئەوەبوو سەری کچەکەی شانە بکات، ویستی خوا وەها بوو باوەڕ بچێتە کرۆکی دڵی ئەم ئافرەتەوە.

دیارە کەسانێك هەبوون کە باوەڕیان بە تاك و تەنیایی خوا هێنا بوو، یەکێ لەوانە ئـەم ئافرەتـەو منداڵـەکانی بـوون، بـەڵام نـەیان دەوێـرا ئاشـکرای بکـەن، چـونکە فیرعـەون نەیدەویست جگە لە خۆی پەرستراوێکی تر هەبێت، بەڵام شاردنەوەی باوەڕی نـاو کرۆکـی دڵ تـا کـەی سـەر دەگرێـت؟ دەبێـت ڕۆژێـك بێـت لـە کـرداروو هەڵسوکەوت و قـسەکردندا دەربکەوێت.

ئەمەشـیان ئافرەتێکـە لـە ئافرەتـە مـەردەکان کـە مەردانـە لـە بـەردەم سـتەم، و ئەشـکەنجەی فیرعەونـدا دانـی بـە خۆیـدا گـرت، و پارێزگـاری لـە بـاوەڕی نـاو دڵـی کـرد پێغەمبـەری ئازیزمـان محمـدﷺ هەڵوێـستی مەردانـەی ئـەو ئافرەتـە پاڵەوانـەمان بـۆ دەگێڕێتەوە.

زۆرن ئەوانەی پاڵەوانانە باوەش بە دینی خوادا دەکەن، بۆ ڕەزامەندی خوا، کـە شـوێن ڕێبازی خواناسی دەکەون، بێ ئەوەی هـیچ مەبەسـتێکی دنیـایی، و هـیچ بەرژەوەندیـەکی کەسی لە دڵیان بێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەن لەو پێناوەدا هەموو شتێ بێتە ڕێگایان.

جـا بەشـێکی ئـەو مرۆڤـە بـەڕێزە فیداکارانـە ئـافرەتن، بـەڵێ.. بـە درێـژایی مێـژوو ئافرەتانیش شان بە شانی پیاوان مەردایەتی باوەڕدارانیـان چەسـپاندووە، هـیچ سـەیریش نیە یەکەم کەسێك کە باوەڕی بە پێغەمبەری ئازیزمـان محمـدﷺهێنـا بێـت ئـافرەت بێـت، ئەویش خەدیجەی پاڵەوانە.

هیچ سەیریش نیە یەکەم کەسێك کە خوێنی گەشی لەسەر ئیسلام بڕژێت ئافرەت بێـت، سومەیەی پاڵەوان بێت.

پاڵــەوانی ئــەم چــیرۆکەمان ئافرەتــە، بــەڵام ئــافرەتێکی یــەکجار مــەردو قارەمــان، ئافرەتێکە هەموو ئەندامێکی نوقمی ناو دەریای باوەڕ بووە.

ئەم ئافرەتە بەڕێزە لە کۆشکی پڕ لە ستەمی فیرعەوندا هەموو خراپەکاریـەك دەبینـێ، بەڵام ئەم تازە باوەڕی هێناوە، و بڕیاری داوە لەگەڵ خوادا بێت، فیرعـەونی سـتەمکاریش دژی دەوەسـتێ، بـەو هـەموو دەسـەڵات و هێـز و سـوپایەوە دژی ئافرەتێـك دەوەسـتێت، هەوڵ ئەدات لە خواپەرستی پەشـیمانی بکاتـەوە، بـەڵام ئـەو مەردانـە دژی دەوەسـتێت و پەشیمان نابێتەوە.

فیرعەونی ستەمکار وەها لە خۆ بایی ببوو داوای خوایەتی دەکرد، خـوای گـەورەش لـە چــەندین هەڵوێــستدا سەرشــۆڕ و خەجاڵــەتی دەکــرد، کــە چــی پەنــدی لــە هیــچیان وەرنەدەگرت، تا دوا جار خوای بە تواناو بەهێز بە هیلاکی بردو نوقمی ژێـر دەریـای نیلـی کرد.

یەکێ لەو هەڵوێستانەی کـە خـوای گـەورە فیرعـەونی سـەر شـۆڕ کـرد، ئـەوە بـوو لـە جادووگەرانەوە هەواڵی زانی بوو، کە منداڵێکی بەنی ئیسرائیلی لە ناوی دەبات.

ئەم ئافرەتە خواناسە هـەوڵی دەدا فیرعـەون نـەزانێ بـاوەڕی هێنـاوە، بـەڵام ئـەوەبوو جارێکیان خەریکی شانەکردنی سەری کچەکەی فیرعەون بوو، شانەکەی لە دەسـت کەوتـە خوارەوە، و وتـی: ((بـسم الله)) ئەمـەش ئاسـاییە کـە موسـڵمان شـتێکی دێتـە ڕێ، بـەڵام کچەکەی فیرعەون سەری سوڕما لەم قسەیە، چونکە باوکی بەخوا دەزانـی، و وای دەزانـی

((بسم الله)) مەبەستی لە باوکیەتی، بۆیە پرسی باوکم؟ واتە: ئەوەی ((بسم الله))ت بۆ کرد مەبەستت باوکم بوو؟

ئافرەتـە باوەڕدارەکـەش وەڵامـی دایـەوە، و وتـی: نـەخێر، پـەروەردگاری منـیش و باوکیشتە (الله).

کچی فیرعەون بەلایەوە سەیربوو، ئەو وای داناوە بـاوکی خـوای بونـەوەر بێـت، کەچـی ئەم ئافرەتە وەهای دەربڕی، کە کەسـێکی تـر هەیـە پـەروەردگاری باوکیـشی بێـت، بۆیـە پرسیاری لێکرد: ئەم هەواڵە بە باوکم بگەیەنم؟

واتە: بەباوکم بڵێم تۆ باوەڕت بـە خـوا هێنـاوەو پـشتت لەخوایـەتی بـاوکم هـەڵکردوە؟ وتی: بەڵێ.

کچی فیرعەون بە تەمای ئەم دامەزراویەی ئافرەتە باوەڕدارە نەبوو، بەڵکو بـە تـەمابوو خۆی بەسەر دەست و پێیدا بخات، و لێـی بپاڕێتـەوە، کـە هـەواڵ بـە فرعـەون نـەدات، تـا خۆی و منداڵـەکانی لـەناو نـەبات، ئەگـەر ئـەو بـاوەڕدارە ئەمـەی بکردایـە، ئـەوا کـچەکەی فیرعەون ئەوەندەی تـر فیـزو دەمـاری بەسـەردا دەکـرد، ئەوەنـدەی تـر منـەتی بەسـەردا دەکرد، کە خۆی و منداڵەکانی لە سایەی ئەودا دەژین.

ئافرەتی باوەڕدار مەردانە هەڵوێستی پاڵەوانانەی هەڵبژارد، ڕەزامەندی نواند تـا هـەواڵ بە فیرعەون بدات، ئیتر نەپاڕانەوە.

کچی فیرعەون هەواڵی بەباوکیدا، و ئەویش ئافرەتی باوەڕداری بانگ کـرد، و پرسـیاری لێکرد، کە ئایا ڕاستە جگە لەفیرعەون خوای تری بۆخوا بڕیار داوە؟

ئافرەتی باوەڕداریش بێ پێچ و پەنا وەڵامی دایەوە، و وتی: بەڵێ (الله) پەروەردگارمە، ئەم هەڵوێستەی ئـەم ئافرەتـە بـاوەڕدارە هەڵبـژاردنی عەزیمەیـە لـەلایان کەسێکەوە، کـە خۆی بناسێت، و متمانەی بە دامەزراوەیی و کۆڵنەدانی خۆی هەبێت، کوفر چی لە دەسـت دێت با درێغی نەکات، چونکە ژیان چەند ڕۆژێکە و کۆتایی دێت.

کە فیرعەون وتەی ئەم ئافرەتـە بـاوەڕدارەی بیـست، ویـستی بـە هەڕەشـە پەشـیمانی بکاتەوە، فەرمانیدا بە شێوەیەکی یەکجار سەخت بە خۆی و منداڵەکانیەوە سزا بدرێن.

فەرمانیدا بە هێنانی مەنجەڵێکی گەورە، کە لە شێوەی مانگادا دروست کرابـوو بیخەنـە سەر ئاگرێکی یەکجار بەتین، ئافرەتەکەو منداڵەکانی یەك لە دوای یـەك بخرێنـە نـاوی، کـە مەنجەڵیان هێناو خستیانە سەر ئاگر، باوەڕدارانیان ئامادە کرد تـا بیانخەنـە نـاوی، بـەڵام ئافرەتە باوەڕدارەکە داخوازیەکی لە پادشا کرد، فیرعـەونیش لای وابـوو بـە ئامـادەکردنی ئەو سزا سەختە، ئافرەتە دڵ ناسکەکە دەترسێ، بۆ ڕزگاری خـۆی و ڕۆڵـە ناسـکۆڵەکانی، دەست و پێی پادشا ماچ دەکات، و لێی دەپاڕێتەوە، تا لێی خۆش ببێ.

ستەمکاران لەبیر خۆیانی دەبەنـەوە، کـە خۆیـان تاوانبـاری ڕاسـتەقینەن بـەوەی، کـە لەخوای بەدیهێنەریان یاخی بوون، و داوای خوایەتی دەکەن، و بە ناڕەوا دژی ئەوانەن کـە مل بۆ پەروەردگاری خاوەن نـازو نیعمـەتیان کـەچ دەکـەن، ئـیتر یـادەبێ خۆیـان بەسـەر دەست و پێی ستەمکاراندا بخەن، یان سەخترین سزا بچێژن.

ئـافرەتی بـاوەڕدار نـەك بـۆ لێبـوردن لـە خـۆی نەپاڕایـەوە، بـەڵکو بـۆ منداڵەکانیـشی نەپاڕایەوە، نەیوت: ئەگەر من تاوانبارم، خۆ ئەو منالآنە هیچ گوناهیان نیە.

ئافرەتـە باوەڕدارەکـە تـەنها یـەك داوای لـە فیرعـەون کـرد، کـە ئـەویش ئـەوە بـوو پاشماوەی لاشە سوتاوەکانی خۆی، و مناڵەکانی کۆبکاتـەوەو بیانخاتـە نـاو کراسـێکەوەو پێکەوەبیان نێژێت، فیرعەونیش بەڵێنی پێدا کە داواکەی جێ بەجێ بکات.

لێرەدا پێمان خۆشە بۆ ئەم بەڵێنەی فیرعەون بۆ جێبەجێ کردنـی ئـاواتی ئـافرەتێکی تاوانبـار هەڵوێـستەیەك بکـەین، تابـە راوردێکـی سیاسـیانی ئـەم چـەرخە لەگـەڵ ئـەو فیرعەونەدا بکەین، کە قورئانی پیرۆز هەڕەشەی لێ دەکات.

ڕەنگە هی وا هەبێ ڕەخنە لە هەڵوێستی ئـەم خوشـکە بـەڕێزە بگرێ کـەوا مناڵـەکانی توشی ئەو ناڕەحەتیە کرد، بەڵام ئافرەتەکە بۆ چوونی باوەڕی خۆی هەیە، چونکە چەندە

بەســەخاوەتەوە گیــانی خــۆی کردۆتــە قوربــانی بــاوەڕ، بــاوەڕداری ڕاســتەقینە خۆشەویسترین‌و ئازیزترین کەسی ئەکاتە قوربانی باوەڕ.

فیرعەونی ستەمکار فەرمانیدا منداڵەکانی ئافرەتە باوەڕدارەکە بهێننە پێشەوە تا ئەوان لە پێش دایکیانەوە بخەنە ناو قازانی سوورکراوە، ئەمەش بۆ ئەوەی ئافرەتەکە پەشیمان ببێتەوە، لە پێشەوە منداڵە گەورەکانیان یەك لە دوای یەك هەڵدانە ناو قازانە گەرمەکەوەو دایکی بەستەزمانیش جگەری بۆ منداڵەکانی هەڵئەقرچا، و فیرعەونی ستەمکاریش لەوە لەزەتی دەبرد، کە ئافرەتەکە ئازاری زیاتر بە جەرگی دەگات.

جەرگی هەڵ ئەقرچاو دانی بە خۆیدا دەگرت، و چاوی لە دەستی پڕ سەخاوەتی پەروەردگاربوو، تا پاداشتی خۆی و منداڵەکانی لەبەهەشتی پان و بەریندا بداتەوە.

دیارە هەموو دایکێك بگرە هەموو مرۆڤێك بەرگەی سەیرکردنی ئەم دیمەنە جەرگ بڕە ناگرێت، بەڵام ئەم ئافرەتە بڕیاریدا بوو بەرگەی لەوە زیاتریش بگرێت.

فریشتەکانی ئاسمانیش چاویان لە دیمەنی جەرگ بڕبوو، داوای لێ خۆشبوونیان لە خوا دەکرد بۆ باوەڕداران، کە دیارە لەو کاتەدا هەڵگرانی باوەڕ لەسەر زەویدا یەکجار کەم بوون.

جەللادەکان بەردەوام یەك لە دوای یەك منداڵی باوەڕدارەکەیان هەڵ دەدانە ناو قازانەکەوە، و ئەوانیش لاشەیان هەڵ دەقرچاو هاواریان لێ بەرز دەبوویەوە، هەتا ئەوەبوو بچوکترین منداڵیان هێنا کە شیرەخۆر بوو، تا فڕێی بدەنە ناو ئاگرەکەوە، بۆ ئەم منداڵەیان ئێشی زۆر بە جەرگی گەیشت کەمێك ڕاوەستاو خەریك بوو پەشیمان ببێتەوە، و لەبەر خاتری منداڵە بچکۆڵەکەی کۆڵ بدات، خێرا خوای گەورە گەیشتە فریای، بەهۆی منداڵەکەوە دەستی یارمەتی بۆ درێژ کرد، هەتا لەسەر هەڵوێستی خۆی دامەزراوبێت.

ئەوەبوو خوای گەورە بە سۆزی ئەو منداڵە شیرەخۆرەی هێنایە قسە، تا ئەمە نیشانە بێت کە هەڵوێستەکەی ڕاستە، و خوای گەورە لەسەر ئەمە ڕێزی تایبەتی بۆ دادەنێ، بەڵێ.. بەفەرمانی خوا منداڵەکە هاتە قسەو ڕووی لە دایکی کرد، کە بە باوشیەوە بوو،

وتی: دایەگیان! هەنگاو بنێ بچۆرە پێشەوە، چونکە ئەم سزایە لە چاو سزای ڕۆژی دوایی هیچ نیە.

ئەمە دوای ئەوەی کە منداڵەکانی تری لە پێشەوە لەبەر چاویدا هەڵقرچا بوون، دایکەکـە کە لە دەمی کۆرپەی شیرەخۆریەوە قسەی بیست، بووە بەڵگـەی دامـەزراوی بـۆی، و بـەر لەوەی ستەمکاران پەلیان بگرن، و فڕێیان بدەنە ناو ئاگرەکەوە بـە خـۆی و منداڵەکەیـەوە خۆیان هەڵدایە ناو قازانی سورەوەبو، و گۆشت و ئێسقانی ئەوانیش هەڵ ئەقرچا.

مێـژووی مرۆڤایـەتی مێژویـەکی دوورو درێـژە، پڕیـەتی لـە سەرگوزەشـتەو چـیرۆك و داسـتان، هەمیـشە خوانەناسـان سـزاو ئـازاری باوەڕدارانیـان داوە، تـەنها لەسـەر بـاوەڕ هێنانیان بەخوا، ئەگینا هیچ تاوانێکیان نەبووە جگە لە پەرستنی خوای تـاك و تـەنیا، بـێ ئەوەی ئاژاوەیەك بگێڕن، بێ ئـەوەی ئـازاری کەسـێك بـدەن، ئـەمڕۆش لەسـەر زەویـدا لـە هەموو وڵاتێکدا خواناسـان سـزا دەدرێـن، و خواناسـانیش دان بـە خۆیـان دەگـرن، و چـاو دەبڕنە ئاسمان و بەتەمای کۆمەکی خوان.

بەڵێ.. ئەم منداڵانەو دایکیان ئەم جیهانەیان بەجێ هێشت، هەروەها فیرعـەونیش هـەر بەجێی هێشت، بەڵام فیرعەون بە تاوانباری و ئەمانیش بەسەر بەرزیەوە، خوای گەورە لـە جیاتی بۆنی گۆشتە سوتاوەکەیان بۆنێکی یـەکجار خۆشـی بـە ئاسمانـدا بڵاوکـردەوە، تـا دروستکراوانی خوا بەهەمیشەیی بۆنی بکەن[1].

لەو فەرمودەیەدا، کە باسی جورەیجی خواناس دەکات ناوی (٣) منداڵ هاتووە، کـە بـە منداڵی هاتونەتە قسە، کە ئەمانەن: عیسای کوڕی مەریەم، و منداڵەکەی سەردەمی جورەیج هەروەکو پێشتر باسی جورەیجمان کرد، لەگەڵ ئـەو منداڵـەش، کـە پەرچـی پاڕانەوەیـەکی دایەوە، لەم فەرمودەیەدا ناوی دوو منداڵی تر هاتووە، کە شاهێدەکەی سەردەمی یوسف و کوڕی ئافرەتە قژ شانەکەرەکەی کچەکەی فیرعەون بوون.

---

١ رواه أحمد فى المسند (٢٨٢١ — ٢٨٢٣) ، والبـزار والكـبرى كمـا فى مجمـع الزوائـد ومنبـع الفوائـد للأمـام الهيثمـى : (٦٥/١) .

هەروەها لە چیرۆکی(أصحاب الأخدود)دا ناوی ئەو منالەش هاتووە، کە غیرەت دەخاتە بـەر دایکـی، تاپێکـەوە خۆیـان بخەنـە ناوچـاڵە ئاگرەکـەوە، هـەروەکو لـە داهـاتوودا باسی(أصحاب الأخدود)دەکەین.

# سەرگوزەشتەی دوانزەهەم

# چاڵە ئاگرینەکە

سەرچاوەی ئەم سەرگوزەشتەیە بەشێکە لەم بەشانەی، کە خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی (البروج)دا باسی دەکات، و پێغەمبەریشﷺلە فەرمودەکانیدا باسی دەکات.

پێغەمبەری ئازیزﷺبۆمان دەگێڕێتەوە، کە لە دێرین زەمانـدا پادشـایەك دەبێت و بە زۆرداری کاروبـاری ڕەعیەتـەکانی بـەڕێوە دەبـرد، بـۆ ئەمـەش وەك پادشـایانی چـاخە کۆنـەکان، پـشتییان بـە جادووگـەرێکی کارامـە بەسـتبوو، چـونکە لـەو سـەردەمانەدا جادووگەرەکان خەڵکیان چاوبەست دەکرد، و پاگانـدەیان بـۆ پادشـاکان دەکـرد، جـاری واش هەبوو ئەو جادووگەرانە خۆیان بەشێوەی زانای ئاینی، و سـەروکاری پەرستگاکانیان دەکرد، و بەناوی ئایینەوە خەڵکیان لەخشتە دەبرد.

ئەو ساحیرانە، کە پادشا بۆ چەسپاندنی حوکمەتەکەی بە کاری دەهێنا پـیر بـوو بـوو، جادووگەرەکە لە ترسی ئەوەی، کە زانستی سیحرەکەی بە مردنی خۆی تیا بچێ، داوای لە پادشا کرد منداڵێکی زیرەك، و بلیمەتی بۆ پەیدا بکات، تا چ زانستێکی لایە بـە ماوەیـەکی کەم فێری بکات، پادشاش زیرەکترین مناڵی بۆ پەیدا کردو ناردیە لای جادووگەرەکە.

شوێنی جادووگەرەکە لە دەرەوەی شار بوو، دەبوایە مناڵەکە هەموو ڕۆژێـك بـچوبایەتە لای جادووگەرەکـەو بگەڕایەتـەوە، لـەکاتی چـوون و گەڕانەوەشـیدا بـەلای ڕاهیبێکـدا تێدەپەڕی، کە بەپەنهانی لە ئەشکەوتێکدا خـۆی حەشـار دابـوو، و خـەریکی خواپەرسـتی بوو، مناڵەکە لە کاتی چوون و گەڕانەوەی لای ڕاهیبە خواناسەکە دەوەستاو گوێی بۆ وتـە باوەڕیەکەی دەگرت، و زۆر دڵـی پـێ دەکرایـەوە، دوای ماوەیـەك جادووگەرەکـەو کـەس و کاری مناڵەکە هەستیان کرد، کە مناڵەکـە دوا دەکـەوێت، چـونکە کـە لـە ماڵـەوە دەهـات،

لەبـەر ئـەوە ماوەیـەك دەچـووە ئەشـكەوت و گـوێی بـۆ خواناسـەكە دەگـرت، درەنـگ دەگەیشتە لای جادووگەرەكە، كاتێكیش كە نیوەڕۆ لای جادووگەرەكە هەڵدەستاو دەچوە لای خوا پەرستەكە، دیسان درەنگ دەگەیشتە ماڵەوە، بەم جۆرە هـەردوو لا لێـی تـووڕە دەبوون و سەرزەنشتیان دەكرد.

كاتێ ئەم وەزعەی خۆی بۆ مامۆستا خواناسەكەی گێڕایەوە، ئامۆژگاری كرد كە لـەلای جادووگەرەكـە بڵـێ: جادووگەرەكـە درەنـگ ڕەوانـەی كردومەتـەوە بەمـە لـە لۆمـەو سەرزەنشت كردن ڕزگارت دەبێ.

ڕۆژان تێدەپەڕین و منالْ خەریكی خوێندنی دوو جۆرە دەرس بوو، دوو جـۆرە دەرسـی دژ بەیەك، لەبەر ئەوەی كە زۆر زیرەك و بلیمەت بوو، زۆر بە ئاسانی هـەردوو دەرسـەكەی ڕەوان دەكرد، تا ئەوەبوو ڕۆژێكیان گیانداریكی دڕندەو كەتە وەكو شێر چەقی ڕێگای لـە خەڵكەكە گرتبوو، و نەی دەهێشت لەوێوە گوزەرە بكەن، كە منالە زیرەكەكـە ئەمـەی دی بە هەڵی زانی تا بزانێ ئەو دوو مامۆستایە كامیان ڕاست دەكات.

ئەم منالە بەردێكی هەڵگرت، و داوای لە پەروەردگاری كرد كە ئەم بەردە دەگرێتە ئـەو دڕندەیـە، ئەگـەر كـاری پیـاوە خواناسـەكەی بـەلاوە خۆشەویـست تـرە لـە كـاری جادووگەرەكە، ئەوا بە هێزو توانای خوا خۆی ئەو دڕندەیە بە بەردەكە بۆی بكوژێ.

هەر كە بەردەكەی گرتە گیاندارەكە بەری كەوت، و بەویستی خوا هەر بەو لێدانە كەوتە زەوی و گیانی دەرچوو، ئەو خەڵكەی كە لە هەردوو سەری ڕێگاكەوە ڕێیان لـێ گیرا بـوو، لەبەر چاویان بوو كە منالەكە بە بەردێك ئەو دڕندە سامناكەی كوشت، وایان زانی منالەكـە زانستێكی زۆری لە جادوودا بە دەست هێناوە.

دوای كوشتنی دڕەندەكە منالەكە هاتەوە لای مامۆستای لـە خـواترس و باسـەكەی بـۆ گێڕایەوە.

خواناسەكەش تێگەیشت كە ئەم منالە باوەڕی وەرگرتووە، و دەنگ و باسیشی بڵاوەی كردووە، ڕۆژێك دێت پادشا لە كاری ئاگادار دەبێ، و بە ئاسانیش لێی دەرناچێت، و وازی لێ ناهێنێت، بەڵكو هەوڵی لەگەڵ دەدا تا لەو باوەڕەی واز بهێنێ، لەوانەیە ناچاری بكات و

ناوی مامۆستاکەی و شوێنی خوا پەرستیەکەی ئاشکرا بکات، بۆیە پێی وت: کوڕەکەم ئەمڕۆ تۆ پێشی منت داوەتەوە، و لای خوا لە من چاکتری، وەك بڵێی ئاگاداری کارت بووم‌و پلە باوەڕیەکەت بڕیون، و کاتی ئەوەت هاتووە خوای گەورە تاقیت بکاتەوە، جا کە تۆ بانگەوازەکەت ئاشکرا دەکەیت، من کاتی ئەوەم نەهاتووە، کە ئاشکرای بکەم، لەبەر ئەوە تکات لێ دەکەم ناو و جێگای من ئاشکرا نەکەیت، جا منداڵەکە دەنگ و باسی بڵاوبویەوە بەهەموو شاردا، کە توانای چاك کردنەوەی کوێر و بەڵەکی هەیە، و خەڵکی هەر نەخۆشیەکی تریان هەبێ دەرمانیان دەکات، هەر نەخۆشێك دەهاتە لای هەواڵی ئەدایێ، کە خۆی توانای بەخشینی شیفای نیە، بەڵکو خوای گەورە چاکیان دەکاتەوە.

بەم شێوەیە کاری پزیشکیەکەی خستبووە خزمەتی بانگەوازەکەیەوە، و دەیوت: هەر کەس هەر نەخۆشیەکی هەبێت کە باوەڕی بە خوا هێنا، ئەم بۆی دەپاڕێتەوە تا خوا چاکی بکاتەوە، ئەوەبوو ئەم منداڵە زیرەکە خەریکی بڵاوکردنەوەی باوەڕ بوو، یەکێ لە دەست و پێوەندی پادشا کوێر بوو بوو، کە هەواڵی پزیشکە بچکۆڵەکەی بیست بە نیازی چاکردنەوەی چاوی، دیاری و بەخششێکی زۆری لەگەڵ خۆیدا برد بۆ لای، منداڵەکەش دیاریەکانی گێڕایەوە دواوە، و هەواڵیشیدا کە ئەم توانای نیە چاوی چاك بکاتەوە، بەڵکو ئەوە کارێکە بە دەستی خوای گەورەیە، جا ئەگەر ئامادەی بە ڕاستی و پاکی باوەڕی پێ بهێنیت، ئەوا منیش بۆت دەپاڕێمەوە تا خوا شیفات بۆ بنێرێ، پیاوە کوێرەکە قەناعەتی کردو باوەڕی بەخوا هێنا، و منداڵەکەش دۆعای بۆکرد، و خوای پەروەردگاریش چاوی چاك کردەوە، کە چاك بوویەوە بە چاوی ساغەوە گەڕایەوە کۆشکی پادشا، وەکو جاران چۆوە لای پادشا، پادشا سەری سوڕما ئەم پیاوە بەیەکجاری کوێر ببوو، ئێستا چۆن هەردوو چاوی چاك بونەتەوە؟ پادشا پرسیاری کرد: کێ چاوەکانتی گێڕایەوە؟

وتی: پەروەردگارم.

پادشا وتی: بۆچی لە غەیری من پەروەردگارێکی تر هەیە؟

وتی: بەڵێ.. پەروەردگاری من و تۆشە.

پادشا هەستی کرد ئەم قسانە وای لێدێت، کە لە وڵاتدا ئاژاوەیەك بەرپا ببێ، و خەڵکەکە بڕوایان بەخوایەتی ئەو نەمێنێ، و واز لە پەرستنیشی بهێنن، چونکە ئەو ستەمکارە وەکو هەموو ستەمکارێکی تر، کەبیەوێ خەڵکی بیپەرستن و لە فەرمانی دەرنەچن، ئیتر جادووگەرەکان دەیانویست خەڵکی چاوبەست بکەن، و هیچ کەسیان خوای پەروەردگار نەناسن، بۆ ئەوەی خەڵکی تریش فێری ئەم قسانە نەبن، کابرای گرت و دەستی بە سزادانی کرد، هەتا ئەویش ناوی منداڵە زیرەکەکەی دا، و پادشا تێگەیشت ئەمە کاری ئەو منداڵەیە کە ناردیە لای جادووگەرەکە تا لە دوا ڕۆژدا ببێتە جادووی کۆشکی پادشایی.

پادشاش ناردی بەدوای منداڵەکەدا، و هێنایان، وای گومان برد، کە بەدەرسی جادووەکە گەیشتۆتە ئەم ئەنجامە، بۆیە لێی پرسی: منداڵ تۆئەوەندە شارەزایی زانستی جادوو بوویت، کە بتوانیت کوێر و بەڵەك چاك بکەیتەوە؟

منداڵەکەش وتی: من ناتوانم کەس چاك بکەمەوە بەڵکو خوای گەورە چاکی دەکاتەوە.

پادشا تێگەیشت کە ئەم منداڵە بڕوای بە خوایەتی ئەو نیە، و گاڵتەش بە جادوو دەکات، کەواتە چ زانست و لێ هاتنی هەیە هیچی بۆ پتەوکردنی پایەی دەسەڵاتی ئەو ناخاتە کار، بەڵکو باوەڕی بەخوای تاك و تەنیا هێناوە.

پادشا هەستی کرد ئەم ئاژاوەیەی دژی موڵك و دەسەڵاتی ئەو بەرپا بووە، دەبێت کەسێك لە دوایەوە بێت، ئەگینا منداڵێك چۆن کەوتە سەر ئەو بیروباوەڕە؟

بۆ ئەمە دەستی بەسزادانی منداڵەکە کرد هەتا ئەویش ڕاستی مامۆستای خواناسی ئەشکەوتی وت: ئەوەی خواناسەکە لێی دەترسا هاتە دی ئەوە بوو، کە بەمنداڵەکەی وت: ڕاستی ئەو نەڵێت، چونکە ئەو چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد، کەسانێکی لێهاتوو فێری خواپەرستی ببن و ئایینی خوا بەخەڵکی بگەیەنن.

کاتێك ڕاهیبە خواناسەکەیان هێنا بەردەمی پادشا، پادشا فەرمانیدا سزای بدەن هەتا لە ئایینی خۆی پەشیمان ببێتەوە، ئەویش بڕیاریدا بوو لەسەر بیروباوەڕی پاکی خۆی

دامەزراو بێت، و گیانی لەو پێناوەدا بە ئاسانی ببەخشێ، پادشا داوای مشاری کرد، و فەرمانیدا خستیانە سەر سەری خواناسەکە، و کردیان بە دوو کەرتەوە، هەروەها پیاوە کوێرەکەی دەست و پێوەندی پادشاشیان هێنا کردیان بەدوو کەرتەوە، هەردوو پاڵەوانەکە لە تاقیکردنەوەی باوەڕ سەرکەوتن، لەبەر ڕەزامەندی خوا دانیان بە خۆیان داگرت، هەوڵی زۆریان لەگەڵ منداڵەکەدا تا واز لە خواپەرستی بهێنی و بگەڕێتەوە، کەچی کۆڵی نەداو لەسەر ڕێبازی خۆی دامەزراو بوو، پادشا ناچار بوو هەوڵی کوشتنی منداڵەکە بدات، چەند جارێك نەخشەی لەناوبردنی کێشا کە چی بێ هودە بوو.

جارێکیان لەگەڵ چەند جەندرمەیەکیدا ناردی و فەرمانی بەسەردا دان، تا بیبەنە سەر لوتکەی شاخێکی بەرزو لەوێ داوای لێبکەن، کە لەئاینەکەی پەشیمان ببێتەوە، و بگەڕێتەوە سەر دینی پادشا، ئەگەر بەگوێی کردن ئەوە بیگێڕنەوە، ئەگینا لەسەر شاخەکە بیخەن خوارەوە.

خوای گەورە ویستی لەسەربوو ئەوان لەناو بەرێت، و ئەمیش لە دەستیان ڕزگار بکات.

ئەوەبوو خوای گەورە پاڕانەوەکەی گیرا کرد، و شاخەکە هاتە لەرزەو پیاوانی پادشا هەر هەموویان بەسەر شاخەکەوە کەوتنە خوارەوە، و منداڵەکە بە تەنیا لەوێ ڕزگاری بوو، بەپێی خۆی گەڕایەوە لای پادشا، پادشا کە ئەمەی دی لە منداڵەکەی پرسی: کوا هاوەڵەکانت؟

منداڵەکە وتی: خوای گەورە منی لەدەستیان ڕزگار کرد ئەمجارە پادشا کۆمەڵێك لە جەندەرمەکانی بانگ کرد و منداڵەکەی دایە دەستیان و وتی: بیبەن سواری کەشتیەکی بکەن، و بیبەنە ناوەڕاستی دەریا، ئەگەر لە دینی خۆی پەشیمان بوویەوە ئەوا چاکە، ئەگەر پەشیمان نەبوویەوە بیخەنە ناوەڕاستی ئاوی دەریاوە.

جەندەرمەکان بردیان هەتا گەیاندیانە ناوەڕاستی دەریا، کە ویستیان بیخەنە ناوی، لەخوا پاڕایەوە تا بەهەر شێوەیەك خوای گەورە ویستی لەسەرە لە ناویان بەرێت، و ئەمیش لە دەستیان ڕزگار ببێت.

بە فەرمانی خوا کەشتیەکە وەرگەڕاو هەموویانی هەڵدایە ناو دەریاو خنکان، و خوای گەورە منداڵەکەی ڕزگار کرد، و بە سەلامەتی گەڕایەوە لای پادشا.

ئەمە دوو جارە منداڵەکە لە دەستی جەندرمەو پاسـاوڵی پاشا ڕزگـاری دەبێـت، لەگـەڵ ئەوەشدا بە پێی خۆی دەگەڕێتەوە کۆشکی پادشا، بێ ئەوەی هەوڵی خۆشاردنەوە بدات، بـەڵکو تەحـەددای پادشـا دەکـات، تـا خـەڵکێکی زیـاتر لـە بانگـەوازی یەکتاپەرسـتی ئاگاداربن، بۆیە هەموو جارێ لەبەردەم پادشادا دەوەستا تادەسـەڵاتی پادشا بۆخـەڵکی دەربکەوێ، و بزانرێ کە پادشا خوا نیە؟

منداڵەکە بەدوای سەر فرازیی خۆیدا نەدەگـەڕا، بـەڵکو دەیویـست عەقیـدەی خواناسـی بڵاوبکاتەوە، ئەگەر چی بە ڕژانی خوێنی خۆشی بوایە، بەڵام بە شێوەیەکی حەکیمانە، جا وەنەبێ لەم کارەشی هەڵەی بەکارهێنابێ، بەڵکو بەژیرانە نەخشەی شـەرعی دەکێـشا، تـا لە ئەنجامدا خەڵك بە ئینصاف باوەڕ بهێنن.

لەو ڕۆژەوە منداڵەکە گیاندارە دڕندەکەی کوشـت، و دەسـتی بەچـاکردنەوەی نەخۆشـی ئەو شارە کرد، و دەنگ و باسی گەورەو بچوکی ناوچەکە گەیشت، ئـەم دوو جـارەش کـە پادشا بە نیازی لەناو بردنیەوە ڕەوانەی کـرد، و بـە سـەلامەتی گەڕایـەوە، ئەوەنـدەی تـر دەنگ و باسی بڵاوبوویەوە بۆ هەر کۆڕو کۆمەڵێك بچویتایە باس باسی منداڵە بچوکەکە بـوو کە پادشا بە دەستیەوە گیری خواردبوو، بە هیچ شێوەیەك بۆی لەناو ناچێت.

منداڵەکە بێباك هاتە بـەردەم پادشـا، پادشـاش وەك جـاری پێـشوو هـەواڵی دەسـت، و پێوەندی لە منداڵەکە دەپرسی، و ئەویش تێی دەگەیاند کە خوای باڵادەست بە سـەلامەتی ئەمی بۆ گێڕایەوە، و ئەوانی لە دەریادا خنکاند.

پادشا بۆی دەرکەوت لەبەردمی ئەم منداڵەدا دەستەوسانە، ئەو کە چاری منـداڵێکی بـۆ نەکرێ، دەبێ چۆن داوای خوایەتی بکات؟

منداڵەکە هەواڵی ڕاستەقینەی نایەمشتی پادشا، کە خۆی ماندوو نەکات، و توانـای نیـە لەناوی بەرێت، مەگەر بەو شێوەیەی خۆی نەخشەی بۆ بکێشێ.

ئەگەر پادشا لەهیچ شتێکدا بەگوێی منداڵەکە نەکات لەم نەخشەیەدا بە گوێی دەکـات، چونکە بەئاواتە لەناوی بەرێت.

منداڵەکەش نەخشەی باوەڕهێنانی خەڵك دەکێشێت، ئەگەر چی بە بەخشینی گیانی خۆشی بێت، هەر ئەوەندەی دەوێ، کە لای خەڵك بسەلمێ پادشا خوا نیە، بەڵکو مرۆڤێکی بێدەسەڵاتەو هیچی تر، پادشای تێگەیاند کە ناتوانێ بیکوژێت هەتا پلانی منداڵەکە پەیڕەو نەکاو چ فەرمانێکی بەسەردا دەدا جێ بەجێی نەکات.

پادشا وتی بە منالەکە: ئەو نەخشەیە چیە؟

منالەکە وتی: ئەوەیە خەڵکی شار هەموویان لە جێگایەك کۆبکەیتەوە، و منیش بە درەختێکەوە، چوار مێخە بکێشی، و پاش ئەوە تیرێك لە تیردانەکەمدا دەربهێنە، پاشان تیرەکە بخەرە کەوانەکەوە، و بڵێ: ((بسم الله رب الغلام)) واتە: بەناوی پەروەردگاری منداڵەکەوە، پاشان تیرەکەم تێ بگرە، پادشا تەگبیری منداڵەکەی بە دڵ بوو لە دڵی خۆیدا وتی: ئەگەر ئەمە ڕاست بێ، زۆر ئاسانە خەڵکی کۆکردەوە، و منالەکەی بە دارێکەوە چوار مێخە کێشا، و تیرێکی لە تیردانی منداڵەکە دەرهێنا، و خستیە ناو کەوانەکە، و پاشان وتی: ((بسم الله رب الغلام)).

دوای ئەوە تیرەکەی تێگرت و بە فەرمانی خوا تیرەکە دای لەلاجانگی منداڵەکە، ئەویش خێرا دەستی خستە سەر لاجانگی، و لە شوێنی تیرەکەدا، و وەفاتی کرد، کە منداڵەکە کەوتە سەر زەوی پادشا لە خۆشیان باڵی دەگرتەوە وای دەزانی ئاژاوەی لە کۆڵ بوویەوە، نەیدەزانی منداڵەکە چ داوێکی بۆ ناوەتەوە.

ئەم هەموو ماوەیە خەڵکەکە سەرەنجی هەڵوێستی منداڵە ژیرو بلیمەتەکەیان دەدا، زۆر بە بەرزی تەماشایان دەکرد، ئەمڕۆش وا هەموویان ئامادەن و چاویان لە هەڵوێستی ڕاستو پاکی ئەوە، و بەچاوی خۆیان دیتیان کە چۆن خۆی کردە قوربانی بیروباوەڕو ئاینی خودا.

هەڵوێستی پاڵەوانانەی منداڵەکە هەر هەموویانی سەرسام کردبوو، کەواتە ڕێبازی منداڵەکە ڕێبازێکی ڕاستە، و هەر پەروەردگاری ئەو شایەنی پەرستنە، و ساڵەهای ساڵە

پادشاو دارو دەستەی خەڵکیان چاو بەست کردووە، بۆیە هەموو بەجارێك ڕایان هاتە سەر ئەوە باوەڕ بە پەروەردگار بهێنن، ئەوەبوو هەموو بە جارێ هاواریان کرد و وتیان: باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری ئەم مندالە.

پادشا بە حیسابی خۆی دەیویست مندالەکە لەناو بەرێت، دەیویست دەزگاو دەسەلاتی لە مەترسی لا بدات، نەی دەزانی بە شەهید بوونی مندالەکە خەڵکەکە لە پادشا هەڵ دەگەڕێنەوە، و باوەڕ بە پەروەردگاری مندالەکە دەهێنن، کە مندالەکە کەوتە سەر زەوی پادشا لە خۆشیان باڵی دەگرتەوە خێرا دارو دەستەکەی بە هەناسە بڕکێوە هاتنە لای پادشا، و وتیان: ئەی پادشا ئەوەی تۆ لێی دەترسای هاتە دی، ئەوەی مندالەکە ئاواتی بۆ دەخواست هاتە دی.

پادشا زۆر ترساو وتی: ئەوانە چی دەڵێن؟ ئەو خەڵکە چۆن دەبێ من نەپەرستن و هەڵبگەڕێنەوە.

پادشا فەرمانیدا لە دەمی ڕێگاکاندا چاڵی گەورە گەورە هەڵ بکەنن.

پڕ لە داری ئەستوور بکرێن.

ئاگر بەر بدرێتە ئەو دارانە.

خەڵکی هەموو کۆبکرێنەوە.

چوار دەوەرەی مەیدان بە جەندرمە بگیرێن.

دەستەو دایەرەی پادشا لە چوار دەورەی چاڵەکاندا دابنیشن، تا چاویان لە قرچەی گۆشت و ئێسقانی ئەو باوەڕدارانە بێ کە واز لە دینەکەیان ناهێنن، و دەخرێنە ناو چاڵە ئاگرینەکانەوە، خەڵکەکە بە زەبرو زەنگی سەربازانی پادشا کۆکرانەوە.

هێنرانە مەیدانی شار.

ئەوانەی باوەڕیان هێنابوو کۆکرانەوە.

ڕێزیان بەست.

چاویان لە ئاگری گڕ بە گوڕ.

ئەم ئاگرە تیژە بۆ ئێمە دەبێ.

سەیری یەکتریان دەکرد.

ئەمە ئاگرە گەورەکە نیە.

بەڵێ ئاگرێکی گەورەیە.

بەڵام ئاگری لەمە گەورەتر هەیە ئاگری دۆزەخ.

سووتان بەم ئاگرە زۆر ناخایەنێ و دەبڕێتەوە.

بۆیە باوەڕدارەکان خێرا بەراوردی هەردوو ئاگرەکەیان دەکرد.

خەڵکەکە بـە سـەیرکردنی یـەکتری، یـەکتریان تـێ ئەگەیانـد کـە تـازە خۆیـان بـە خـوا فرۆشـتووە، فریـشتەکانی ئاسمـانیش دۆعـای سـەربەرزی و سـەرکەوتنیان بـۆ دەسـتەی بـاوەڕداران دەکـرد، ئـەمجا بـاوەڕداران یـەك لـە دوای یەکـەوە فـڕێ دەدرانـە نـاو ئـاگری چاڵەکانەوە، هەر هەموو بە غیرەتێکی بێ وێنەوە دەکەوتنە ناو ئاگری چاڵەکەوە.

لەم کاتەدا ئافرەتێك کە کۆرپە شیرە خۆرەکەی بـە باوەشیەوە بـوو، سـەرەی هـات و نزیکی چاڵەکە کەوتەوە تا باز بداتە ناوی کە بیری لە کۆرپەی باوەشـی کـردەوە، بـەزەیی پیاهاتەوەو ئەوەی بە دڵدا هات کە ئەم بەستەزمانە تاوانی چیە؟

بۆ ئەمە منداڵەکەی دایە دواوەو دڵی نەهات بە کۆرپەکەیەوە باز بداتە ناو چـاڵە پـڕ لـە ئاگرەکەوە.

خوای گەورەش ویستی وابوو تا ڕەنجی باوەڕی ئەو ئافرەتە ڕاستگۆیە بە زایە نەچێت، مناڵە شیرە خۆرەکەی هێنایە زمان و وتی: دایە گیان! ئارام بگرە تۆ لەسەر ڕاستی.

گرنگ ئەوەیە مرۆڤ لەسەر حەق بێت.

گرنگ ئەوەیە مرۆڤ ڕاست بێت.

بەڵێ.. باوەڕداران بە سەری بەرزەوە سەریان نایـەوە، و سـتەمکارانیش بـە ویـژدانێکی مردووەوە ماوەیەك ژیان و سەریان نایەوە بەڵام بە سەر شۆڕیەوە.

باوەڕداران چوونە بارەگای خوا بەو پەڕی ڕێزەوە، ستەمکارانیش چوونە بارەگای خواوە بەو پەڕی سوکایەتیەوە و بەرەو دۆزەخ ڕاکێشران [١].

خوای گەورەش چیرۆکی ئەم ڕووداوەمان بۆ باس ئەکات لە قورئاندا، هەروەکو ئەفەرمووێ: ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡبُرُوجِ ۝١ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡمَوۡعُودِ ۝٢ وَشَاهِدٖ وَمَشۡهُودٖ ۝٣ قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ ۝٤ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ ۝٥ إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا قُعُودٞ ۝٦ وَهُمۡ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ شُهُودٞ ۝٧ وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ۝٨﴾. (سورة البروج، الآية: (١-٨).

---

١ رواه مسلم (٣٠٠٥) ، والترمذي (٣٣٤٠) .

# سەرگوزەشتەی سیانزەهەم

## کوڕی قەشە

بە فڕۆکـە لـە جدەوە دەچـووم بـۆ پـاریس، کـە چـاوم پـێ کـەوت ناسـیمەوە، سـەری خستبوە بان سەرینی کورسیەکە، دەیویست بخـەوێت، پـێم گـوت: سـڵاوی خـوات لـێ بـێ باوکی موحەمەد تۆ لە کوێی؟

بەڕاستی ڕێکەوتنێکی جوانە لەناو فڕۆکە چاوم پێت بکـەوێت، نـاهێڵم بخـەویت چـونکە کـاتی خـەوتن نیـە، ئـەی ئـەم هـەموو کچ و کـوڕە فەرمانبەرانـەی میوانـداری نـابینی کـە پێویستیان بە بانگ کردن و ئامۆژگاری و ڕێنمـوویی هەیـە، هەڵـسە سـەر پـێ و قۆڵـت لـێ هەڵماڵە، بەڵکو خوای گەورە یەکێکیان لەسەر دەستی تۆ ڕێنمایی بدات.

ئەویش سەری بەرز کردەوەو سەیری کردم، هەر کە ناسیمیەوە هەڵـساوە سـەر پـێ، و گوتی: دکتۆر سەرحان لە زەوی ناتبینم لە ئاسمان دەتدۆزمەوە؟

بەخێر بێی بەخێر بێی، پێشبینیم نەدەکرد لەناو فڕۆکە بتبیـنم، بـەڵام هـەردەم تـۆ لـە خەیاڵم بووی، پێشبینیم کرد لە فەرەنسا یان لە خواروی ئەفەریقیا بتبینم، ئایا ئێـستاش لەوێ کاردەکەیت لە نووسینگەی ڕابیتە؟ پێم بڵێ ئەو ساتە خۆشـانە چـین کـەوا دەتبیـنم ڕاوەستاوی لە بەردەمم لەناو فڕۆکە؟ من بڕوا بە چاوەکانم ناکەم؟

گوتم: ڕاستیە برام ڕاستیە، بەڵام پێم بڵێ بیرت لە چی دەکردەوە؟

وتی: بیرم لەو منداڵە تەمەن (١٠) ساڵە دەکردەوە لـە (جۆهانـسبیرگ) کـە چـاوم پێـی کەوت خۆی بووەتە موسڵمان، بەڵام باوکی قەشەیەو نەبوەتە موسڵمان.

وتم: منداڵێك بووەتە موسڵمان و باوکیشی قەشەیە؟

وتی: من لە شاری (جوهانسبیرگ) بووم، جارێکیان لە مزگەوت نوێژم دەکرد منـداڵێکی تەمـەن(١٠)سـاڵانەم بـینی بەپۆشـاکی عـەرەبی نوێـژی دەکـرد، پۆشـاکێکی سـپی لەگـەڵ عەبـەیاکی (خـەلیجی) لەسـەر شـانەکانی لەگـەڵ چـەفیەو عـەگال لەسـەری، دیمەنەکـەی ڕایکێشام، چونکە خەڵکی ئەفەریقیای خواروو ئەم پۆشاکە ناپۆشن، ئەوان تـەنها کـراس و

پانتۆڵ لەبەر دەکەن، و کڵاوێك لەسەر دەکەن، یاخود جل و بەرگی موسڵمانان بە شێوازی هیندی و پاکستانیەکان دەپۆشن.

منداڵەکـە بـە تەنیـشتمدا تێپـەڕی سـڵاوێکی موسـڵمانانەی لێکـردم، و منـیش وەڵامـی سڵاوەکەیم دایەوە، و پێم وت: ئایا خەڵکی سعودی؟

منداڵەکە وتی: نەخێر من موسڵمانم و ئینتیمام بۆ هەموو وڵاتانی ئیسلامی هەیە.

منیش زۆر سەسام بووم و لێم پرسی: باشە بۆچی ئەم پۆشاکە (خەلیجیەت) پۆشیوە؟

وتی: چونکە من شـانازی پێـوە دەکـەم و پۆشـاکی موسـڵمانانە " لـەو کاتـەدا پیاوێـك تێپەڕی کە منداڵەکەی دەناسی، سەرم سوڕما کاتێك پێی وتم: لێی پرسیار بکە بزانە چۆن بووەتە موسڵمان؟

منیش بە پیاوەکەم وت: بۆچی موسڵمان نەبوو؟

پاشان پرسیارم لە منداڵەکە کرد: ئایا تۆ پێشتر موسڵمان نەبوویت؟

ئایا تۆ لە بنەماڵەیەکی موسڵمان نیت؟

منداڵە بچوکەکەش وتی: من چیرۆکەکەم لە سەرتاوە تا کۆتای بۆت باس دەکەم، بەڵام یەکەمجار پێم بڵێ تۆ خەڵکی کوێی؟

وتم: خەڵکی شاری مەککەی پیرۆزم.

هەر کە گوێی لە وەڵامی من بوو بەرەو لای من هات و ویستی باوەشم پێدا بکاو ماچم بکات، وتی: خەڵکی مەککە خەڵکی مەککە چەندە دڵخۆشم بە بینینی پیاوێـك کـە خـەڵکی شاری مەککەی پیرۆز بێت.

منداڵەکەش وتـی: مـن کـوڕی قەشـەیەکی کاسـۆلیکیم، لـە شـاری شـیکاغۆی ئـەمریکی دەژیام، لەوێ گەورە بووم و لە باخچەیەکی ساوایانی ئەمریکی فێری خوێندنەوەو نووسین بووم، باوکم زۆر گرنگی پێدەدام لەلایـەنی فێربـوون و پـەروەردە، بـەو شـێوەیە بـاوکم لـە کتێبخانەی کەنیسە جێی دەهێشتم بـۆ خوێندنـەوەی گۆڤـارە تایبەتیـەکانی منـداڵان، کـە ڕەنگاو ڕەنگ بوون بە چیرۆکی مەسیحی.

ڕۆژێك لە ڕۆژان لە پەرتوکخانـە بـووم، دەسـتم گەیـشتە پـەرتووکێك لەسـەر یـەکێك لـە ڕەفەکانی کتێبخانەکە، کە خوێندمەوە بینیم پەرتووکی ئینجیلە.

ویستم لە نێو پەڕاوەکانی ئینجیلەکە بگەڕێم، هەر کە کتێبەکەم کردەوە لەگـەڵ یەکـەم بینین چاوم کەوتە سەر دێڕێکی سەرسوڕهێنەر، ئەو دەقەم خوێندەوە کە پێغەمبەر عیسا (سـەلامی خـوای لێ بـێ) دەفـەرموێ: لـە دوای مـن پێغەمبـەرێکی عـەرەب دێـت نـاوی (ئەحمەد)ە، منیش سەرم سوڕما لەم وشەیە، بە پەلە چوومە لای باوکم و زۆر بـە سـانایی پرسیارم لێی کرد، و گوتم: باوکە گیان! باوکە گیـان! ئایا ئـەم وتـەت خوێندۆتـەوە لـەم ئینجیلە؟ باوکم وتی: وتەی چی؟

وتی: وتەیەکی سەرسوڕهێنەرە پێغەمبەر عیسی (سەلامی خـوای لێ بـێ) تیایـدا ئـەڵێ: پێغەمبەرێکی عەرەب لە دوای من دێت! باوکە گیان ئەو پێغەمبەرە عەرەبە کێیە کە دوای ئەو دێت کە دەڵێت: ناوی (ئەحمەد)ە؟

باوکە گیان! ئایا تا ئێستا ئەو پێغەمبەرە هاتووە یان نەهاتووە؟

لەکاتی ئەو قسانەدا بووم بـاوکم هـاواری کـرد بەسـەرمدا وتـی: ئـەم کتێبـەت لـە کـوێ هێناوە؟

وتم: لە پەرتوکخانەم هێناوە باوکە گیان! پەرتوکخانەی کەنیسە، پەرتوکخانەکـەی تـۆ کە تیایدا دەخوێنیتەوە.

باوکم وتی: ئەم کتێبـەم پـێ بـدە ئـەوە درۆ و بوختـانی تیایـە بـە پێغەمبـەر (عیسی) ((سەلامی خوای لێ بێ) هەڵبەستراوە.

وتم: باوکە ئایا نابینی ئەم دەقە لە ئینجیل نووسراوە چۆن درۆ و بوختانی تیایە؟

قەشەکە کەوا باوکی منداڵەکەیە وتی: تۆ چ کارت بەوە هەیە، تـۆ هێـشتا منـداڵیت، لـەو شتانە ناگەیت بڕۆ بۆ ماڵەوە.

ئەمجا بـاوکم دەسـتی ڕاکێـشام و بردمیـە ماڵـەوە هـاواری لەسـەر کـردم، و هەڕەشـەی لێکردم بە ئازاری توند و بە ئێش ئەگەر واز لەو وتەیە نەهێنم.

بـەڵام مـن زانـیم نهێنیـەك هەیـە بـاوکم دەیـەوێت لـە مـنی بـشارێتەوە، بـەڵام خـوای پەروەردگار ڕێنمایی کردم تا بە دوای هەموو عەرەبێك بگەڕێم بۆ ئەوەی بگـەم بـە ئـەنجام دەستم کرد بە گەڕان بە دوای عەرەب بۆ ئەوەی پرسیاریان لێ بکەم.

هەر لە شارۆچکەکەمان چێشتخانەیەکی عەرەبیم دۆزیـەوە، چـوومە ژوورەوە پرسـیارم دەربارەی ئەم پێغەمبەرە عەرەبە کرد، خاوەنی چێشتخانەکە پێی وتم: بچۆ بـۆ مزگـەوتی موسڵمانان، لەوێ باشتر بۆت باس دەکەن، منیش چووم بۆ مزگەوت، لەناو مزگەوت بـانگم کرد، ئایا لێرە هیچ کەسێکی عەرەب هەیە؟ یەکێکیان وتی: چیت دەوێ لە عەرەب؟

وتم: دەمەوێت پرسیار دەربارەی پێغەمبەری عەرەب (ئەحمەد) بکەم؟

وتیان: فەرموو دانیشە دەتەوێ چی بزانیت دەربارەی پێغەمبەری عەرەبی؟

وتم: لە پەرتوکخانەی کەنیسە لە ئینجیل خوێندمەوە کە پێغەمبەر(عیسی) ئەفـەرموێ: لە دوای من پێغەمبەرێك دێت ناوی (ئەحمەد)ە، ئایا ئەوە ڕاستە؟

پیاوەکە وتی: بە ڕاستی تۆ ئەوەت خوێندۆتەوە؟

وتم: بەڵێ...

وتی: کوڕی خۆم ئێمەی موسڵمان شوێنکەوتەی پێغەمبـەری عـەرەبین کـە نـاوی(ﷺ) قورئانی ئێمەش ئەوەی باسکردوە کە تۆ بۆت باسکردین.

منداڵەکەش دەنگی بەرز کردەوە هەروەکو شـتێکی ون بـووی دۆزیبێتـەوە وتـی: (ئایـا ئەمە ڕاستە؟).

پیاوەکە وتی: بەڵێ ئەمە ڕاستەو هیچ گومانێکی تیا نیە، ئەمجا پیاوەکە ڕۆیشت و دانەیەك لە قورئانی هێنا، و ئەو ئایەتەی سورەی (الصف)ی کردەوە کە خوای پەروەردگار ئەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾[1].

واتە: (بیربکەرەوە) کاتێك کە عیسای کـوڕی مەریـەم وتـی: ئـەی نەتـەوەی ئیسرائیل بێگومان من نێردراوی خوام بۆ لای ئێوە، ئەو تەوراتەی کە لە پێش مندا هاتووە بەڕاسـتی دائەنێم، موژدەتان پێ دەدەم بەپێغەمبەرێك، کە لە دوای من دێ و ناوی(أحمـد)ە، ئینجـا کاتێك، کە ئەو (پێغەمبەرە) چەندەها نیشانەی ڕوون و ئاشـکرای بـۆ هێنـان وتیـان: ئەمـە جادوویەکی ئاشکرایە[2].

---

١ ـ الصف : ٦

٢ـ پوختەی تەفسیری قوئان : ئامادەکردنی مەلا محمد مەلا صالح لاپەرە ٥٥٢ .

منداڵەکەش بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: ئەم ئایەتەم پێ نیشان بدە، ئەنجا کابرایەکە ئایەتەکەی پێ نیشاندا.

منداڵەکەش هاواری کرد و وتی: ئەی خوایە گیان! هەروەکو ئەوەی ئینجیل هاتووە پێغەمبەر (عیسی) درۆی نەکردووە، بەڵکو باوکم درۆی لەگەڵ کردووم.

ئەمجا منداڵەکە وتی: من چی بکەم تا ببمە شوێن کەوتەی ئەو پێغەمبەرە، کابراش وتی: بڵێ: ((أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، وعيسي ابن مريم عبده ورسوله)).

واتە: شایەتمان دێنم کە جگە لە (الله) هیچ خودایەکی تر نیە، و شایەتمانی دەدەم کە محمدﷺ بەندەو نێردراوی خوایە، و عیسای کوڕی مەریەم بەندەو نێردراوی خوایە.

منالەکەش ئەمەی دووبارە کردەوە و وتی: ((أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، وعيسى ابن مريم عبده ورسوله)).

ئەمجا منداڵەکە وتی: موژدە بەو پێغەمبەرە محمدﷺ، ئەمڕۆکە چەند دڵم خۆشە، دەچم موژدە بە باوکم دەدەم.

ئەمجا منداڵەکە خێرا ڕای کرد بۆ لای قەشەی باوکی وتی: باوکە گیان! باوکە گیان! ئەمڕۆ گەیشتمە هەقیقەت ئێستا موسڵمانان لە ئەمریکا هەن، و ئەوان شوێنکەوتەی پێغەمبەر محمدﷺن قورئانم لەلایان بینی، باس لەو ئایەتە دەکات کە نیشانم دای لە ئینجیل، باوکە گیان! ئێستا من موسڵمانم وەرە لەگەڵم تۆش موسڵمان بە، پێغەمبەر (عیسی) وای پێ ڕاگەیاندووین قەشەی باوکی هەروەکو چۆن بروسکێك لەسەری بدات ئاوای لێهات، هەستا کوڕە بچکۆڵەکەی ڕاکێشا، و لە ژوورێکی بچووك بەندی کرد و، وتی: ڕەحمی پێ نەکەن، چەند هەفتەیەك لەو زیندانیەدا مایەوە، خواردن و خواردنەوەی بۆ دەهێناو پاشان دەرگای لەسەر دادەخست، بەڵام ئەو قوتابخانەی کە کوڕەکەی تیایدا دەیخوێند دەهاتن و لێیان دەپرسی: کە ئەو کوڕە بۆچی نایەت بۆ قوتابخانەو دیار نیە؟

قەشەی باوکی ترسا کارەکەی پەرە بسێنێ و دووچاری زیندان بێت، بیری کردەوە کوڕەکەی دووربخاتەوە بەرەو (تنزانیا) لە ئەفەریقیا کە دایك و باوکی قەشە لەوێ دەژیان ئەم بیرۆکەی جێ بەجێ کرد و ناردی بۆ (تنزانیا) بەدایك و باوکی خۆی ڕاگەیاند کە

بەزەیی پێ نەکەن، ئەگەر گەڕایەوە سەر ئـەو دینـەی چـووەتە سـەری، ئەگـەر هـەر دادی نەدا ئەوا هەر لەوێ بیکوژن، بۆیە لە ئەفەریقیا کەس بە دوای سۆراغیدا ناگەڕێت.

ئەمجا مندالّەکە بـە زۆری سـەفەری کـرد بـۆ (تنزانیـا)، بـەلاّم ئیسلامەتیەکەی لـە یـاد نەکرد، لەوێ زیاتر گەڕا بە دوای عەرەب و موسلّمانان، تاکو مزگەوتێکی دۆزیـەوەو چـووە ژوورو دانیشت لەگەلّ موسلّمانانەکان، باسی چیرۆکی خـۆی بـۆ کـردن ئـەوانیش سـۆزێکی زۆریان پێدا فێری ئاینی ئیسلامیان کرد.

کاتێك باوکی قەشە بەوەی زانی وەکو باوکی زیندانی کرد، پاشان بە لێدان لـە لاشـەی ئەدا بەلاّم لەگەلّی سـەرکەوتوو نـەبوو، نـەیتوانی مندالّەکـە پەشـیمان بکاتـەوە، نـەیتوانی ویستی خۆی بەسەردا بسەپێنێ، زیندان و ئازاردان زیاتر هێزو خۆڕاگری پێ دەبەخشی بـۆ بەجێ گەیاندنی ویستی خوا لە کۆتاییدا بـاوکی قەشـە ویـستی بیکـوژێ، ژەهـری بـۆی لـە خواردن کرد، بەلاّم خوای گەورە پارێزگاری لێکردو نـەمرد، چـونکە دوای ئـەوەی تـۆزێکی خوارد هەستی بە ئـازاری سـکی کـرد و ڕشـایەوە، پاشـان لـە پەنجـەرەی ژوورەکـە خـۆی فڕێدایە نـاو سـتارەکەو پاشـان بـۆ نـاو باخـچەکە، خێـرا مالّەکـەی بـە جێهێـشت و بـەرەو مزگـەوت بـە ڕێکـەوت بـۆ لای بـرادەرە موسـلّمانەکانی، ئـەوانیش هـەر زوو بـە زووی چارەسەرییان بۆ کردو، خوای گەورە شیفای بۆ نارد.

بۆیـە کوڕەکـە داوای لێکـردن لای خۆیـان بیـشارنەوەو پاشـان بـە نهـێنی بردیـان بـۆ (ئەثیوبیا) و دەیان کەس لەسەر دەستی موسلّمان بوون، و بانگی کردن بۆ ئاینی ئیسلام.

پاشان موسلّمانان لـە ترسـی ئـەوەی فەلـەکان زیـانێکی لێبـدەن بردیـان بـۆ خـوارووی ئەفەریقیا، لەگەلّ زانایان دادەنیشت و لەگەلّ بانگەوازان ئامادە دەبوو لە هەر شوێنێك بـا، خەلّکی بانگ دەکرد بۆ ئیسلام و دەیـوت: ئـەم ئاینـە هەققـەو ئـاینی فیترەتـە ئەمـە ئـەو ئاینەیـە خـوای گـەورە فـەرمانی پێکـردوین شـوێنی بکـەوین، ئـەم ئاینەیـە کـە پێغەمبـەر (عیسی) (سەلامی خوای لێبێ) مـوژدەی داوە کـە پێغەمبـەر(ﷺ) لـە دوای ئـەو دێـت، و پێویـستە خـەلّك هـەمووی شـوێنی بکـەون، مەسـیحیەکان ئەگـەر شـوێنی مەسـیحیەتی ڕاستەقینە بکەون ئەوا دلّخۆشی دونیا و دوا ڕۆژ دەبن، ئەوەتا ئینجیلی دەستکاری نـەکراو کە لە کتێبخانەی کەنیسە دۆزیمەوە لە (شیکاغۆ) ئەو بەهرەیەم لێ دەست کەوت.

خوای گەورە ڕێنوومایی کردم بۆ ئەم کتێبە، لەگەڵ یەکەم پەڕ کە کردمەوە یەکەم دێر کە خوێندمەوە دەقەکە ئاماژەی ئەوەی بۆ کردم کە پێغەمبەر (عیسی) (سەلامی خـوای لێ بێ) فەرمویەتی: پێغەمبەرێکی عەرەب لە دوای من دێت ناوی ئەحمەدە.

خوایە گیان! چەند بە ڕەحم و بە سۆزو بە بەزەییت کەوا ڕێنماییت کردم کاتێ کـە مـن کوڕی قەشەیەك بووم کە ئینکاری ئەم هەقیقەتە ئەکات.

دکتـۆر گیـان! بەڕاسـتی کاتێـك گـوێم لـەو منداڵـە گـرت فرمێـسك لـە چـاومدا ئەهاتـە خوارەوە، ئەم هەموو ڕێگا دووەری بڕی بەس بۆ پاراستنی ئاینەکەی پاشان گـوێم لێگـرت و تەوقەم لەگەڵ کرد و ماچم کرد و پێم وت: خوای گەورە(إنـشاء الله)خێـر و پاداشـتت بـۆ دەنووسێ، ئەمجا منداڵەکـە خـوا حـافیزی لێکـردم و لـە مزگـەوت چـووە دەرەوە هـەرگیز سیما و ڕوخساری پڕ لە ڕووناکی و ئیمانی لە یاد ناکەم، ڕووخساری ئەو منداڵە بچکۆڵە کە ناوی (محمد) بوو.

جارێکیان سەفەرم کرد بۆ ئەفەریقیای خواروو، وێنەی محمدی بچکۆڵە هـەر لـە خـەیاڵم بوو، پرسیارم لێیان کرد لە بارەی ئەم کوڕە پێیان وتم: لێرە بوو، بەڵام سەفەری کـرد بـۆ شارێکی تر، چونکە بانگەوازی خەڵك دەکات بۆ لای خوا[١].

---

١ـ قصص الهدایە، للداعیە : عمرو خالد، إعداد وتنسیق : فوزیە جڑبە.

# سەرگوزەشتەی چواردەهەم

# ویستی بەرەو فەسادی ببات

ڕابردوو چەند جوانە، لـە هـەمان کاتـدا چـەند تاڵـە، هـەردوو سـیفەت لـە یادگاریـەکانی پیاوێکدا کۆبونەتەوە، دوو سیفەتی دژ بە یەك، من هەوڵ ئەدەم ڕابردووم بە یاد بێتەوە تا بەڕاتەتی منداڵیم تیایدا ببینم، هەروەها هەوڵ ئەدەم ڕابکەم لـە یادکردنـەوەی، تـاکو ئـەو ناخۆشی و تاڵیەم نەیەتەوە یاد.

ڕۆژێکیان کـچێکی گەڕەکەکـەمان سـەرنجی ڕاکێـشام، بـەو جـۆرە سـەیری دەکـردم لـە ماناکەی نەدەگەیشتم، بەڵام سەیرکردنی عیـشق و خۆشەویـستی نـەبوو، هـەر چـەندە مـن عیشق و خۆشەویستی نازانم، چونکە من ئەو کات دڵم نەبوو تەماشای هیچ کەسـێك بکـەم، منیش لەناو بیرو هۆشی خۆم زۆرم لێکدایەوە، تا بڕیارمدا شەڕی پێ بفرۆشم، بۆیە پارچـە شیعرێکی دڵداریم پەیدا کرد، و لە ڕێگای دەرگای ماڵەوەیان بۆم نارد، بـەڵام هـیچ وەڵامـی نەبوو، منیش توڕە بـووم و ویـستم ئـەو کـچە بـەرەو ڕێگـای شـەڕ ببـەم جـا بیـەوێت یـان نەیەوێت، ئەمجارە شیعرێکم نووسـی وەك گاڵتـە کـردن بـە ئـەو، بـەڵام بـەبێ نـاو هێنـانی هەواڵەکەی پێ گەیشت، بەڵام ئـەو هـیچ ڕەفتـارێکی دژم نـەکرد، و بەسـەر خـۆی نـەهێنا، شەوێکیان کاتژمێر نزیکی چواری بەیانی بوو دەگەڕامەوە ماڵەوە (من لـەو کەسـانە بـووم، کەبـەڕۆژ وون دەبـووم و بەشـەو دیـار دەکـەوتم) لەبـەر دەرگـای ماڵەکـەمان کتێبێکـی زیکرەکانی پێغەمبەرﷺم دۆزیەوە، منیش سوور هەڵگەڕام و زۆر تـووڕە بـووم و هەرچـی ئیرادەی هێزی شەڕ هەیە لە خۆم کۆکردەوە، چونکە زانیم ئەو کچە ناردویـەتی و ئیعلانـی شەڕی لەگەڵ کردووم، ئەو کات بیرۆکەی ئـەوەم بـۆ هـات پارچـە شـیعرێك بنووسـم باسـی چیرۆکی خۆشەویستی نێوان خۆم و ئەو بکەم و لە گەڕەك بـڵاوی بکەمـەوە، بـەم کـارەش ناوو شەرەفی بریندار دەکەم، شەیتانیش ئیلهامی شیعری بـۆ هێنـام و شـیعرێکم نووسـی و ناردم بۆی، هەروەها هەڕەشەم لێکرد بە بڵاوکردنەوەی بە هەموو ناسیاوانی، ئەو کەسـەی

شیعرەکەم پێیدا ناردبوو هاتەوە لەگەڵ چەند دەنکە خورمایەك، پێی وتم: (کـچەکە ئـەمڕۆ بە ڕۆژووە خەریکی ڕۆژوو شکاندنە، لـە بـڕی شـیعرەکە ئـەو چـەند دەنکـە خورمایـەی بـە دیاری بۆی ناردووی و وتـی: لـە کـاتی ڕۆژوو شـکاندن داوا لـە خـوا دەکـات کـە هیدایـەتت بدات)، بۆیە دەنکە خورماکانم وەرگرت و فڕێمدانە سەر زەوی و چاوم سوور و پـڕ بـوو لـە شەڕو بەڵێنم پێیدا کە تۆڵەی لێ بکەمەوە زوو یان درەنگ، تا لە ژیاندا بم وازی لـێ نـاهێنم لەسەر ڕێگای خێر، هەروەها دەچـوومە سـەر ڕێگـای مزگـەوت ئـەو کـات کـە ئـەو دەچـوو دەستم دەکرد بە گاڵتە جاری و ئیهانە کردن، بەڵام ئەو کچانەی کە لەگەڵی بوون زۆر پێـی پـێ دەکـەنین، لەگـەڵ ئـەوەش هـیچ کاتێـك وەڵامـی نەدەدامـەوە، ڕۆژگـار تێپـەڕی بینـیم هەرەسم هێنا لە هەوڵەکانم کە ئەو کچە گومڕا بکەم، بەڵام ئەو بەردەوام کتێبی ئایینی بـۆ دەهێنام، و لە گشت ڕۆژەکانی دووشەممەو پێنج شەممە کە بە ڕۆژوو دەبـوو خورمـای بـۆ دەناردم، وەك بڵێی پێی دەوتم: بە سەرتدا سەرکەوتم من ڕەفتارەکانیم وا لێك دەدایەوە.

دوای چەند مانگێک سەفەری دەرەوەی وڵاتم کرد بۆ گەڕان بە دوای شادی و ئـارەزووە دونیاییەکان کە لە وڵاتـی خـۆم نەمـدیبوو، نزیکـەی (٤) مـانگ مامـەوە، ئـەو کـات کـە لـە دەرەوەی وڵات بووم بەردەوام بیرو هۆشم لای ئـەو کـچە بـوو، چـۆن لـە گـشت پیلانـەکانم ڕزگار بوو، بڕیارمدا هەر کە گەڕامەوە وڵات دووبارە دەست بکەمەوە بە شەڕکردن لەگەڵی، بە شێوازێکی زیرەکتر، بڕیارمدا لە ئاینداری وەرگەڕێنم و بیهێنمە سەر ڕێگای شەڕ.

وادەی گەڕانەوەم هات، ئەو ڕۆژەی گەڕامەوە پێنج شەممە بوو، لەم ڕۆژانە بوو کە ئـەم کچە تیایدا بە ڕۆژوو دەبوو، لە فڕۆکە قاوەو خورمایان پێشکەش کردین، قاوەکەم خـواردو خورماکەم فڕێیدا (چونکە نیشانەی ڕۆژوو گران بوو).

پاشان فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی شارەکەم دابەزی، کاتژمێر یەکی نیوەڕۆ بـوو، سـواری تەکسی بـووم و هاتمـەوە ماڵـەوە، یەکسەر برادەرەکـانم هاتنـە سـەردانم، ئـەمجا دیـاریم پێشکەشی هەموویان کرد، دیاریەکانیش گشتیان شتی خراپ و کوفر بوون، دیاریەکیش بۆ کچەکەم ئامادە کردبوو کە لە هەموو دیاریەکان خراپترو کـوفرتر بـوو، ویـستم بـۆی بنێـرم

بزانم ڕەفتاری چۆن دەبێت، چوومە سەر ڕێگای مزگەوت بۆ بینینی پێش نوێژی مـەغریب، ئەو بەردەوام نوێژەکانی لە مزگەوت دەکرد، چونکە ڕێکخراوێکی ئافرەتان بۆ لەبـەرکردنی قورئان لەوێ هەبوو، بانگی مەغریب دراو نوێژ کرا، بەڵام کـچەکەم نـەبینی، سـەرم سـوڕما وتم: دیارە کچەکە وازی لە نوێژو مزگـەوت هێنـاوەو گـۆڕاوە، لـەو ماوەیـەی مـن لەسـەفەر بووم، وە زۆریشم حەز ئەکرد کەوا پێشبینیەکانم ڕاست بن.

پاشـان گەڕامـەوە مـاڵ کاتێـك کتێبـەکانم تەماشـا کـرد، چـاوم بـە (قورئانێـك) کـەوت لەسەری نووسرابوو (دیاریە بۆ تۆ بەڵکو خوای گەورە ڕێنماییـت بکـات بـۆ ڕێگـای ڕاسـت) واژوو / ناوی کچەکە)، منیش لە خزمەت کارەکەم پرسی کێ ئەم کتێبەی ناردووە وەڵامـی نەدامەوە، بۆ ڕۆژی دواتر چوومە دەرەوە بۆ چاوەڕوانی ئەو کچە کە لـە دەرگـای مزگـەوت (قورئانەکەم) لە دەست بوو تاکو بیدەمەوەو پێی بڵێم پێویـستیم پێـی نیـە، چـاوەڕوانیم کرد لە نزیك مزگەوتەکە، بەڵام نەهات چەندین ڕۆژ بەم شێوەیە چاوەڕێیم کـرد، بـەڵام بـێ سوود بوو، منیش چوومە ماڵیان لە یەکێك لە مناڵە بچوکەکانم پرسی: کـە لەگـەڵ براکـانی ئەم کچە یاریان دەکرد، لێم پرسین: ئایا فلانەکەس لێرەیە؟

مناڵەکانیش تەماشایەکیان کردم و وتیان: دیارە تۆ خەڵکی ئەم گەڕەکە نیت؟

وتم: بەڵێ.. بەڵام نامەیەکم لەلایەن هاوڕێیەکی ئەو پێیە حەز دەکەم بچن بیدەنێ.

وتیان ئەو کچەی پرسیاری لێدەکەی بەر لە دوو مانگ، لە مزگەوت و لە کاتی کڕنـووش بردندا وەفاتی کرد.

لەو کاتەوە نەمزانی چیم بەسەر هات، دونیا لەبەر چاوم تاریك بوو، خەریك بوو بکەومـە سەر زەوی، دڵم نەرم بـوو، فرمێـسك لـە چاوانما ئەهاتـە خـوارەوە، ئـەم دوو چـاوەم کـە ماوەیەك بوو نەیدەزانی فرمێسك چیە؟

نەم توانی هۆکـارو تەفـسیری ئـەم خەمـە زۆرە هـەڵبگرم، ئـەمجا بـە پیـادە گەڕامـەوە ماڵەوە، زۆر دڵتەنگ بووم و نەمدەزانی ڕوو لە کـوێ بکـەم و بـۆ کـوێ دەچـم لـە دەرگـای

ماڵەوەم دەدا لە کاتێکدا کلیلی دەرگام لە گیرفانمدا بوو، هەموو شتێکم لە یاد کردبوو، لـە یادم کرد من کێم و چیم؟

تەنها سەیرکردنەکانی ئەم کچەم دەهاتەوە یاد کـە لـە تەمـەنی منداڵیـدابوو، ئـەو کـات زانیم کە سەیرکردنەکانی بە ڕقەوە نەبوو، بەڵکو سك سوتان و بەزەیی بـوو، ئـەو بـە هیـوا بوو لە شـەڕو خراپـەم دوور بخاتـەوە، دوای مردنـی بڕیارمـدا کـەس و کـارم بـەجێ بهێڵم، کەسوکارو خزمەکانم نزیکەی ساڵێك بە جێ هێشت، لـە شـوێنێکی دوور لـە گەرەکەکـەمان نیشتەجێ بووم، حاڵ و ژیانم گۆڕاو بەردەوام لە خەیاڵ و لەبەر چاوم بوو، تەنانەت لەکاتی تەنیایشدا هەر لە خەیاڵمدا بوو، بەردەوام دەهاتەوە بەرچـاوم کاتێـك دەچـۆوە مزگـەوت و دەهاتەوە، هاوڕێکانم زۆر هەوڵیان دا تا بزانن موشکیلەم چیە؟

بەڵام من هۆیەکەم پێ نەوتن، هەروەها ئـەو (قورئـان)ەی بـە دیـاری پێـشکەشی کـردم بەردەوام تا ئێستا لەگەڵمەو ماچی دەکەم و دەگریم، ئەو کاتەی کـە گەڕامـەوە مـاڵ دوای بیستنی هەواڵەکە یەکسەر دەست نوێژم هەلگرت و نوێژم کرد، بـەڵام کەوتمـە سـەر زەوی، هەر چەند هەڵدەستامەوە دەکەوتمەوە، چونکە بە درێژایی ژیانم نوێژم نەکردبوو، ئێستاش بەردەوامم لە خواپەرستی، داواکاریشم لـە خـوای گـەورە لـە بەهەشتدا بەیەکـەوە کۆمـان بکاتەوە لە ژێر سایەی ڕەحمەتی خۆی (آمین)[١].

---

١ـ قصص الهدایه، للداعیه : عمرو خالد، إعداد وتنسیق : فوزیه جژبه.

# سەرگوزەشتەی پانزەهەم

## لە پاش مردن بۆنی میسكی لیْ دەهات

كچێك لە تەمەنی (٢٠) ساڵیدا بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل مرد، تۆزێك بەر لە مردنـی كـەس و كاری لێیان پرسی: حاڵت چۆنە وتبووی: باشم سـوپاس بـۆ خـوا، بـەڵام دوای تۆزێـك مـرد خوا لێی خۆشبێت.

پاشان هێنایان بۆ شوشتنی كاتێك لەسەر تەختـە دارەكـە داماننـاو دەسـتمان كرد بـە شوشتنی سەیری ڕوخساری درەوشاوەیمان كرد وەكو خەوتویەكی دەم بە پێكـەنین وابـوو هیچ برین و شكان و خوێن پرژانی نەبوو.

مردوو شۆرەكە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: كاتێك ویستیان بەرزی بكەنەوە تاكو بـە تـەواوی بیشۆن ئاوێكی سپی لە لووتی هاتە دەرەوە كە ژوورەكەی پڕ كرد لە بۆنی میسك.

ئێمەش هەموومان دەستمان بە (ماشاء الله) و (سبحان الله) كرد و وتم: ئەو كچە ژیـانی چۆن بوو؟

وتی: هەر لەتەمەنی (١٠) ساڵیەوە هەموو فەرزەكانی جێبەجێ دەكرد بەبێ دواخستن و وازهێنان، هیچ كاتێك سەیری فیلم و تەلەفزیۆنی نەدەكرد، و گوێی لـە گـۆرانی نـەدەگرت، هەر لە تەمەنی (١٣) ساڵیەوە هەموو دووشەممان و پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبـوو، نیـازی هەبوو خۆی تەرخان بكات بۆ شوشتنی مردوان، بەڵام بەر لـەوەی هـیچ مردوویـەك بـشوات خۆی بە مردوویی شۆردرا، مامۆستاكان و هاوپۆلەكانی باسیان لە ڕەوشت بەرزی و ڕەفتار جوانی ئەو كچە دەكرد، و ژیان و مردنی كاری تێكردین [١].

---

١ـ (قصص الهدایه، عمرو خالد، إعداد وتنسیق : فوزیه جژبه).

# سەرگوزەشتەی شانزەهەم

## خوایە گیان لەناو سکی باڵندەدا حەشرم بکەیت

ئەو کەسەی لە پێناوی خـوادا دەکوژرێـت پێـی دەوترێـت شـەهید، خـوای پـەروەردگار کۆمەڵێك تایبەتمەندی بۆیان داناوە، یەکێك لەو تایبەتمەندی و پلەو پایەی کە پـەروەردگار دەیبەخشێت بە شەهیدان تکاو شەفاعەت کردنە، بۆیە شەهیدی کاروانی بانگەوازی خوایی لە دوا ڕۆژدا شەفاعەت دەکات بۆ (٧٠) کەس لە خزم و کەس و کارەکانی.

سەرکردەیەکی موسڵمانان لە غەزاکانی دژ بە ڕۆمەکان بە نـاوی (ئـەبو قدامـە) ئـەڵێت: ئەمیری سوپای موسڵمانان بووم، و بانگەوازم کرد بۆ جیهاد، تورەکەیـەك و کاغـەزێکم بـۆ هات کاغەزەکەم کردەوە تیایدا نووسرابوو:

(بسم الله الرحمن الرحیم لە ئافرەتێکی بەندەی خواوە بـۆ ئـەمیری سـوپای موسـڵمانان سڵاوت لێ بێت پاشان ئەڵێم: تۆ بانگت کردین بۆ بەشداریکردنی جیهاد لـە پێنـاوی خـوادا منیش تواناو هێزی جیهادو جەنگم نیە، ئەو تورەکەیەش پرچمی تیایە بۆ ئـەوەی بیکـەیت بـە زیـنی وڵاخەکـەت، بـەڵکو خـوای پـەروەردگار بەشـێك لـە پاداشـتی موجاهیـدانم پـێ ببەخشێت.

(ئەبو قدامە) ئەڵێت: سوپاسـی پـەروەردگارم کـرد لەسـەر هەڵوێـستی ئـەو ئافرەتـە، و دڵنیا بووم لەوەی کە موسڵمانان هەست بە بەر پرسیاری خۆیان دەکەن، و یەك دەنگن لـە بەرامبەر دوژمنەکانیاندا.

کاتێـك ڕووبـەڕووی دوژمـن بووینـەوە منـداڵێکی تـازە پێگەیـشتووم لـە ڕیـزی سـوپای موسڵماناندا بەرچاو کەوت، گومانم وابوو ئەو منداڵە لەبەر بچوکی تەمـەنی شـیاوی جـەنگ نیە، و فەرمانم پێدا بە گەڕانەوە منداڵەکە وتی: چۆن فەرمانم پێ دەکەیت بە گەڕانەوە لـە کاتێکدا خوای گەورە ئەفەرموێت:﴿ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا﴾؟

(ئەبو قدامە) دەڵێت: ئیتر وازم لێی هێنا، پاشان منداڵەکە پێی وتم: (٣) تیرم بـە قـەرز پێ بدە.

منیش سەرسام بووم و بەزەییم پێدا هاتەوە و پێم وت: ئەوەی دەتەوێت بە قەرز پێت دەدەم بە مەرجێك ئەگەر خوای گەورە شەهادەتی پێ بەخشیت شەفاعەت و تکام بۆ بکەیت؟

منداڵەکە وتی: (إنشاء الله) منیش (٣) تیرەکەم پێدا پاشان بە حەماسەت و هێزەوە ڕووبەڕووی دوژمن ڕۆیشت، و جەنگا تا لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا کەوت.

بە درێژایی جەنگەکە چاوم لێکەلا نەکرد، و سەرسامی کردبووم و بەزەییم پێدا هاتەوە، بەڵام کاتێك کەوت چوومە سەری و پێم وت: خواردن و ئاوت دەوێت؟

وتی: نەخێر، بەڵکو پێویستیم پێت هەیە؟

پێم وت: هیچ شتێك لەلام خۆشەویستر نیە لەوەی کە پێویستی تۆ جێبەجێ بکەم چیت دەوێت فەرمانم پێ بدە؟

منداڵەکە لەگەڵ دوا هەناسە پاکەکانیدا وتی: سڵاوم بگەیەنە بە دایکم و کەل و پەلەکەمی بۆ بەرەوە.

وتم: دایکت کێیە؟

وتی: دایکم ئەو ئافرەتە بوو کە پرچەکانی خۆی بۆ هێنایت کاتێك نەیتوانی لە سوپاکەتدا بەشداری بکات.

وتم: خوا بەرەکەت ببارێنێتە سەر ئاڵ و بەیت و خزم و کەس و کارت.

پاشان گیانی دەرچوو.

دواتر باڵندەیەك هات لە گۆشتی لاشەی منداڵەکەی خوارد.

منیش بەم دیمەنە زۆر سەرسام بووم.

ئەمجا لەسەر ڕاسپاردەی منداڵەکە گەڕامەوە بۆ لای دایکی کاتێك چاوی پێم کەوت بەرەو ڕووم هات و وتی: (ئەبو قدامە) هەواڵم پێ بدە ئایا هاتووی پرسەم لێ بکەیت یان پیرۆزبایی؟

وتم: مەبەستت چیە؟

دایکەکە وتی: ئەگەر منداڵەکەم مردووە ئەوە هاتووی پرسەم بۆ دابنێیت، ئەگەر لە پێناوی خوادا شەهید بووبێت، و ئەو ئاواتەی هاتبێتە دی ئەوا پیرۆزباییم لێ دەکەیت.

منیش باسی کوڕەکەی و باسی باڵندەکەم بۆ کرد...

دایکەکە وتی: خوای پەروەردگار نزای منداڵەکەمی گیرا کردووە، و وەڵامـی داوەتـەوە وتم: نزاکەی چی بوو؟

وتی: کوڕەکەم لە کاتی نوێژی بەیانیان و ئێواران لە خودا دەپاڕایەوە و دەیوت: خوایە گیـان! لـەناو سـکی باڵنـدەدا حەشـرم بکـەیت.. (ئـەم پاڕانەوەیـەش ئاماژەیـە بـەو فەرموودەیەی پێغەمبـەرﷺ کـە دەفـەرموێت: ڕۆحـی شـەهیدان لـەناو سـکی باڵندەدایـەو بەبەهەشت دا دەگەڕێت.

دایکەکـە وتـی: سـوپاس بـۆ خـوا کـە نـزای کوڕەکـەمی وەڵام دایـەوە، و ئاواتەکـەی هێناوەتە دی.

(ئـەبو قدامـە) دەڵێـت: ئـەمجا تێگەیـشتم کـە بۆچـی خـوای پـەروەردگار سـەرکەوتنی بەخشی بە موسڵمانان و سەری خستین بەسەر دوژمندا [١].

---

١ـ التربية الإسلامية: ژمارە (٦) کانونی دووەمـی ١٩٩٩ لاپـەڕە ٣٥. حـسن الخاتمـە، یوسـف الحـاج أحمد.

# سەرگوزەشتەی حەڤدەهەم

## مندالەكەت ئاوا پەروەردە بكە

چەندە زۆرن ئەو هەلویستانەی لە كاتی منالیمان لیمان روویداوە، هیشتا لە هزرو بیرماندا ماوەتەوە تا ئەمرۆش، جا خۆش بیت یان ناخۆش.

بگەریوە بۆ یادەوەریەكانی رۆژی مندالیت، ئەو كات ئەوەت دیتەوە یاد كە خەلاتیكت وەرگرتووە لە قوتابخانە یان كەسیك لە جیگەیەكی گشتیدا بە تۆیدا هەلٚ وتبیت.

چەند زۆرن ئەو ئامۆژگاری و چاكە كردنانەی كە بەرامبەر مندالٚ كراوە، و بوەتە ریگەی كارتیكردنی نەك تەنها بۆ مندالەكان، بەلكو بۆ باوك و دایكیشیان بە دەست هینانی خۆشەویستی و ریزی ئەوانیش زۆر جار بۆ چاكەكار دووبارە بۆتەوە.

كەواتە خەندەیەكت بەرامبەر مندالان بە كەم مەزانە، و هەلسوكەوتی باش و جوانیان لەگەلٚ ئەنجام بدە.

د.محمد العریفی دەلیت: لە وتاریكمدا بۆ قوتابیانی سەرەتایی دەربارەی گەورەیی نویژ پرسیارم لیكردن، كیٚ لە ئیوە دەزانیت فەرمودەیەك دەربارەی گرنگی نویژ بلیت؟ خویندكاریكی مندالٚ وەلامی دایەوە و وتی: پیغەمبەرﷺ دەفەرمویت: ((بین الرجل وبین الكفر أو الشرك ترك الصلاة)). واتە: لە نیوان مرۆڤی باوەرداروبیٚ باوەردا وازهینانە لە نویژ كردن.

وەلامەكەی دلی گرتم بۆیە یەكسەر سەعاتی دەستی خۆمم كردەوە و پیم بەخشی، بەگشتی كاتژمیریكی زۆر گران بەها نەبوو بەلام هەلویستەكەی بوو بەهۆی ئەوەی، كەپالٚ بەم مندالەوە بنیت بۆفیربوونی زانست و رووكردنە لەبەركردنی قورئان، رۆژان و سالان تیپەرین هەتا لەمزگەوتیك دیم وا سەیر دەكەم پیش نویژەكەی ئەو مزگەوتە ئەو مندالەیە[١].

١ـ المجموعه الزهبیه، د . محمد بن عبدالرحمن العریفی .

# سەرگوزەشتەی هەژدەهەم

## لە ڕۆژی دوایی ناترسیت؟

جارێکیان پێشەوا (ئەبو حەنیفە) (ڕەزای خوای لێ) بێ بە شوێنێکدا دەڕۆیشت: ئاگای لێ نەبوو پێی لەسەر پێی منداڵێك دانا، منداڵەکە ئازاری پێ گەیشت و وتی: ئەی پێشەوا (ئەبو حەنیفە) دیارە لە تۆڵە سەندنەوەی ڕۆژی دوایی ناترسیت، وا پێت نا بەسەر پەنجەی قاچم داو ئەزیەتت دام؟

نازانی خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا حەق و مافی کەس بەسەر کەسەوە ناهێڵێت؟

پێشەوا (ئەبو حەنیفە) کە گوێی لەم قسەیە بوو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو دەستی بە لەرزین کردو کەوتە خوارەوە لە هۆش خۆی چوو[1].

---

١ـ حياة الإمام أبو (حنيفة) .

# سەرگوزەشتەی نۆزدەهەم

## ئاگات لە خۆ بێ

ڕۆژێکیان پێشەوا (ئەبو حەنیفە) (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) بـە لای منداڵێکدا تێدەپـەڕێ تەماشا ئەکات ئەم منالە یاری بە قوڕ ئـەکات، پێـشەوا (ئـەبو حەنیفـە)ش بـە منداڵەکـەی فەرموو: ڕۆڵە گیان! وریابەو ئاگات لە خۆت بێ نەکەویتە نـاو ئـەم قـوڕەوە، دوای هـەموو لەشت پیس دەبێت، و دایکت لێـت دەدا، منداڵـە بـچکۆڵەکەش سـەری هـەڵبڕی و پێـشەوا (ئەبو حەنیفە) ی ناسی و وتی: من ئاگام لە خۆیە، ئەگەر بشکەومە نـاو قوڕەکـەوە گـرنگ نیە، بەڵام تۆ ئاگات لە خۆت بـێ، مـن ئەگـەر بکەومـە نـاو قـوڕەوە هـیچ زیـانم لـێ نـادات دەچمەوە بۆ ماڵ و دایکم پاکم ئەکاتەوە، بەڵام ئەگەر تـۆ بکەویتـە نـاو قـوڕەوە جیهانێك ئەکەیتە ناو قـوڕەوە، تـۆ ئاگـات لـە خـۆ بـێ ئەگـەر زانایـەك هەڵـە بکـات میللـەتێك هەڵـە دەکاتو سـەرەنجامی خـراپ دەبـێ، ئاگاردارېـە لـە ڕێگـای دیـن لا نـەدەی و نەچـیتە نـاو قوڕاوی بێ دینیەوە، چونکە ئەو کاتە خـەڵك بـە هـۆی تـۆوە گـومڕا دەبـن، پێـشەوا ئـەبو حەنیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە ئەو قسە بەجێ و پڕ بـە حیکمەتـەی لـەو منداڵـە بیـست دڵی هەژاو لەشی لەرزی.

دەفـەرموێت: لەسـەر قـسەی ئـەو منداڵـە: دوای ئـەوە هـەموو جـارێ یـەك مـانگ لێکۆڵینەوەم لە فەتوایەکان دەکرد ئەمجا ڕامدەگەیاند[1].

---

١ـ ژیانی پێشەوا (ئەبو حەنیفە)

# سەرگوزەشتەی بیستەم

## ئەی خودا لە کوێیە؟

تیشکی گەرمی خۆر بڵاوبوەوە، و بەسەر دەشت و دۆڵ و چیاکان و بیابـانی مەککـەدا، کردبووی بە پشکۆی سورکراوە، هەروەك ئەوەی بیەوێت لەناو ئەو لمە گەرمەدا ئـەو سـزاو ئازارەی کە تووشی بیلالی حەبەشییان کرد، کە لە ژێر تاشە بەردی گەورەدا بە دەنگێکـی شیرانە هاواری دەکردو دەیوت: ((أحد أحد)).

ستەم لە هەموو لایەکەوە دەوری دابـوو، هـەروەك ئـەوەی ئـاگر لـە لاشـەی بـەربێت و ئازاری بدات.

لە هەموو لایەکەوە هاواری دەکرد سکاڵای خۆی دەبرد بۆ ئەو زەویە چۆڵەی کە لە ژێـر کارەسـاتە سروشـتیە توندەکانـدا ناڵـەی دەهـات، و بـەو هـەموو دامـەزراوی چەسـپاویەی خۆیەوە خەریك بوو لەت لەت بێت.

دەشت و دۆڵەکانی مەککە کپ بوون و لە جووڵـە کـەوتبوون، هـەر ڕێبوارێـك لـە دەروە بوایە ئاواتی دەسکەوتنی سێبەرێك بوو.

((عبداللـەی کـوری عومـەر)) ئـەو ڕۆژە بـە هـۆی هەنـدێك ئـیش و کـاری خۆیـەوە لـە گەڕانەوەی بۆ ناو شاری مەککە دواکەوتبوو، لە دەرەوەی مەککە بوو، بۆیە هەوڵی ئەدا بە زووتـرین کـات خـۆی بگەیەنێتـەوە مەککـە لەگـەڵ ((عبـدالرحمن))ی هاوڕێیـدا هـەنگاوی خێرایان دەنا، هەردووکیان لەبەر گەرماکە دەم وچاویان هەڵپێچابوو کە تـەنها چـاویان بـە دەرەوە بوو لە تێنوویەتی دا هێزیان لەبەر بڕا بوو.

هەردووکیان بە دەشتی مەککەدا دەڕۆیشتن و مەبەستیان بوو بگەنە مەککە، هەسـتیان کرد کە توانای ڕۆیشتنیان نەماوە، چونکە زۆر مانـدووبوون، لـە تێنوێتیـدا قورگیـان وشـك ببوو، نیشانەی ماندویەتی و بەسەرو ڕوخساریانەوە دیار بوو.

چاویان بە دەوروبەر دەگێڕا، بە لای ڕاست و چەپدا ئەگەڕان بۆ شوێنێکی گونجاو بۆ ئەوەی قەیلولەیەکی تێدا بکەن، و کەمێك لە سێبەرکەیدا پشوو بدەن، زۆر تێنوو بوون و قوڕگیان وشك بوو، ئەمجا ((عبداللەی کوڕی عومەر)) تەماشای هاوڕێکەی کرد، وەك ئەوەی بڵێ زۆری تێنوە، و زۆریش ماندووە، بۆیە وتی: ئەمڕۆ زۆر پێویستیمان بە قومێك ئاوە بۆ ئەوەی گەروومان کەمێك تەڕ بکات، سوێند بە خوا ناتوانم چیتر ئارام بگرم.

((عبدالرحمن))ی هاوڕێی وتی: نازانم پێش ئەوەی هەردووکمان بخنکێین ئایا دەبێت چاودێریی خوای ئاگای لەم حاڵە بێت کە ئێمە تێداین؟

سوێند بە خوا من ئامادەم بە هەموو ماڵەکەم جامێ ئاو بکڕم، ئەگەر مرۆڤ ئاوی دەست نەکەوێت ماڵ بە کەڵکی چی دێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾.

لە دووری بیابان ڕەشاییەکیان دی، کاتێك لە ڕەشاییەکە نزیك بوونەوە، وایان زانی ئیتر ئاواتەکەیان هاتۆتە دی، تەماشایان کرد شوانێکە دوای ئەوەی کە سەگەکەی کردووە بە پاسەوانی مەڕەکان، ئێمەش بە لای شوانەکەدا تێپەڕین، کەوا زۆر منداڵ بوو، پاشان سەلاممان لە شوانەکە کرد ئەویش بە جوانترین شێوە وەڵامی سەلامەکەی داینەوە، و بەخێرهاتنێکی زۆر گەرمی لێ کردین، و لە شوێن سێبەرەکەی خۆی داینیشاندین، کە جێی دوو کەسی زیاتر لێ نەدەبۆوە، یەکسەر شوێنەواری تێنویەتی بە ڕوخساری میوانەکانیانەوە بەدی کرد، و بە پەلە چوو مەڕێکی بۆ دۆشین و قاپێکی بۆ پڕ کردن لە شیرو گەڕایەوە بۆ لایان و وتی: فەرموون شیر بخۆنەوە هیوادارم تێنویەتی و ماندویەتیەکەتان نەهێڵێت، ئەمجا خواردیانەوە.

پاش ئەوەی کە شیرەکەیان خواردەوەو، و سوپاسی خوایان کرد لە سەر نازو نیعمەتەکانی، قاپە شیرەکەیدا دەست شوانەکە و وتی: زۆر سوپاست دەکەین.

کاتێ هەردووکمان تێر شیرمان خواردەوەو شیرەکە زۆر بوو بە هەردووکمان تەواو نەکرا.

ئـەمجا شـوانە بـچوکەکە قاپـە شـیرەکەی وەرگـرت، و لـە تەنیـشت خۆیـەوە داینـا، ((عبداللـەی کـوڕی عومـەر))یـش پـێش ئـەوەی بـە شـوانەك بڵێـت پاشمـاوەی شـیرەکە بخواتەوە کەمێك تەماشای کـرد، پاشـان بـە شـوانەکەی وت: ئایـا بۆچـی پاشمـاوەی ئـەو شیرە ناخۆیتەوە؟ خۆ گەرما خراپی نەکردووە.

وتی: نایخۆمەوە.

وتی: بۆچی نایخۆیتەوە؟

وتی: من بەڕۆژووم.

وتی: ڕۆژووی چی؟

وتی: بەڕۆژووم.

پاشان وتم: ئەی شوانە بچکۆڵەکە خودا پاداشی بەخێرت بداتەوە، ئێمە سـێ ڕۆژە لـەم سەفەرە داین و دەممان لە خواردن نەداوە؟

شوانەکەش وتی: خۆزگە خواردنێکم شك ببردایەو پێتـانم بدابایـە.. ئـەو کاتـە خـۆم بـە برسیەتی دەهێشتەوە.

((عبداللەی کوڕی عومەر))یش وتی: دەمانەوێت مەڕێکمان بۆ سەر ببڕیت و بیخۆین.

((عبداللەی کوڕی عومەر)) هەر لە سەر قـسەکەی بـەردەوام بـوو وتـی: مـەڕێکمان بـۆ سەر ببڕە، با بیخۆین و تۆش لەگەڵماندا بیخۆ.

شوانەکە وەڵامی نـەبوو بۆیـە ((عبداللـەی کـوڕی عومـەر)) وتـی: گـەر خـۆت بـە تـەنها ناتوانیت ئامادەی بکەیت ئەوا ئێمەش لەسەر بڕین و ئامادەکردنیدا یارمەتیت ئەدەین؟

لەم کاتە ناخۆشەدا شـوانەکە نەیـدەزانی چـی بڵێـت، چـونکە تەماشـای خـۆی دەکـات بچوکە، و خاوەن مەڕەکانیش لێی قبوڵ ناکەن.

بۆیە وتی: من خاوەنی ئەو مەڕانە نیم، بەڵکو خـۆم و مەڕەکانیـشم مـاڵی گەورەکـەمن، ڕێی ئەوەی پێداوم کە شیرەکەی بدەم بە ڕێبوار، بەڵام ڕێی نـەداوم یـەك دانـەی لـێ سـەر ببڕم.

((عبداللەی کوڕی عومەر)) وتی: ئێستا گەورەکەت لە کوێیە؟

وتی: نزیکەی (١٠٠)فرسەخ لێمانەوە دوور دەبێت.

((عبداللەی کـوڕی عومـەر)) وتـی: مـادام گەورەکـەت ئەوەنـدە دوورە ناتبینێـت، وەرە مـەڕێکمان بـۆ سـەر بـبڕە، چـەندی کـرد پارەکـەت ئـەدەمێ، شـوانی منـاڵیش بـەدڵ و دەروونێکی پاکەوە وتی: ئەی ئەگەر گەورەکەم بەوە ڕازی نەبوو؟

ئایا پێویست ئەکات پێی بڵێم؟

ئەی پارەکەی چی لێ بکەم؟

وتی: پارەکەی بۆ خۆت هەڵگرە، و بە گەورەکەشت مەڵێ، شـوانەکە بەسـەر سامیەوە وتی: مەڕەکە بفرۆشم و بە گەورەکەشم بڵێم گورگ خواردویەتی؟

منداڵەکە بەم پرسیارە ڕووی زۆر گرژ بوو.

دوای هاواری کردو وتی: ئێوە ئەڵێن: چی؟

مەڕێك سەر ببڕم پارەکەشی وەربگرم، و بە گەورەکەم بڵێم گورگ خواردویەتی؟

((عبداللەی کوڕی عومەر)) وتی: بەڵێ.. ئەتوانی هەر بە گەورەکەشت نەڵێی...

وتی: ئایا ئەتوانم لـە پـەروەردگاری بـشارمەوە کـە ئاگـاداری هـەموو بوونـەوەرە؟ ئایـا ئەتوانم کە پەروەردگار پێی نەزانێت؟

((عبداللـەی کـوڕی عومـەر)) وتـی: تـۆ کابرایـەکی هـەژاریت لـە دونیـادا هیـچت نیـە، گەورەکەشت دەوڵەمەندەو بە کەمبوونی مەڕێك هیچ کەم ناکات، ئەها ئەم ئەرکە قورسەت پێدەکات، و خستۆتیە ئەستۆی تۆ، تۆش تۆڵەی خۆت بکەوە ((عبداللەی کـوڕی عومـەر)) وتی: وەرە مەڕەکە سەر دەبڕین، و ئەم نهێنیەش لە نێـوان خۆمانـەو بـە کەسـی نـاڵێین و باسی ناکەین؟

شوانەکە بەو بچوکیەی خۆیەوە وتی: چۆن دەتوانی داوا لە من بکەیت کـەوا سەرپێـچی خوا بکەم.

((عبداللەی کوڕی عومەر)) وتی: من پێم وتی: کە تۆ کەسێکی هـەژارو دەسـت کـورتی، بەڵێنی ئەوەشم پێ دایت کە باسی مەڕەکە نەکەم لای گەورەکەت؟

ئەویش هاواری کردو وتی: ئەی خودا لەکوێیە؟ ئەی خودا لەکوێیە؟

ئـەمجا بـاوەڕی ئـەم منداڵـە بـۆ ئـەم دوو هاوەڵـە بـەڕێزە دەرکـەوت، و هەسـتیان بـە بەرزبوونەوەی باوەڕ کرد.

پاشـان ((عبداللـەی کـوڕی عومـەر)) پرسـیاری لـە شـوانەکە کـرد لـە بـارەی نـاوی گەورەکەی، و شوێنی نیشتەجێ بوونیەوە ئەویش پێی وت: کە گەورەکەی یەکێکە لە پیاو ماقوڵانی شاری مەککەو ناونیشانی تەواوی پێدا.

((عبداللـەی کـوڕی عمـر))یـش بـە پەلـە خـوا حـافیزی لـە شـوانەکە کـرد، و لەگـەڵ (عبدالرحمن)ی هاوەڵیدا بەرەو شاری مەککە گەڕانەوە، لە ڕێگـادا ئـەم دەسـتەواژەی ئـەم منداڵەیان دەوتەوە ئەی خودا لە کوێیە؟ ئەی خودا لەکوێیە؟

ئـەمجا ((عبـدالله ی کـوڕی عمـر)) بـەو پـەڕی ماندوویەتیـەوە گەڕایـەوە مەککـە، (عبدالرحمن) داوای لێکرد کە جارێ بچن لە ماڵەوە پشویەك بدەن، ئـەمجا بـچێت بـۆ سـەر کارەکەی، بەڵام ((عبداللەی کـوڕی عومـەر)) وەڵامـی نەدایـەوە، بـەڵکو چـووە نـاو شـاری مەککە، و پرسیاری دەربارەی خاوەنی شوانەکە دەکرد، هـەتاکو دۆزیـەوە، ئـەمجا شـوانە بچکۆڵەکە، و هەموو مەڕەکانیشی لێ کڕی، پاشان هەندێك کەسی کرد بـە شـایەت بەسـەر خۆیەوە بەوەی کەوا ئەو شوانە بڕوادارەی لەبەر خوا ئازادکردووە، و هەموو مەڕەکانیـشی پێدا، پاشـان ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە کـە خـوای پـەروەردگار ئەفـەرموێ: ﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ﴾[1].

١ـ (ئەی خودا لە کوێیە ؟ وەرگێڕانی: جەزا باپیری / لا ١ ) .

# سەرگوزەشتەی بیست و یەك

## منی لە نەفامی و نەزانین ڕزگار کرد

زانای بەناو بانگی ئیسلام (سری سەقەتی) منداڵ بوو لە خزمەت مامۆستاکەیدا قورئانی دەخوێند، کاتێ گەیشتە سەر ئەم ئایەتە کە خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ﴿وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا﴾ (مریم :٨٦).

واتە: گوناهکاران و تاوانبارانیش بەپێ و بە تینوویەتی بەرەو دۆزەخ راودەنێن، و لێ ئەخوڕین وەکو گاگەل بۆ ئاوەخۆرە مل دەنێن[١].

وتی: مامۆستا گیان (وِرْدًا)واتای چیە؟

مامۆستاکەی وتی: نازانم.

پاشان گەیشتنە ئایەتی﴿لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا﴾ (مریم : ٨٧).
واتە: دەسەڵاتی تکاو لاڵەیان نیە جگە لەو کەسەی بەڵێنی لە خوای میهرەبان وەرگرتوە (وەك پێغەمبەران و شەهیدان)[٢].

وتی: ئەی مامۆستا (عهداً) واتە چی؟ مامۆستاکە وتی: نازانم.

(سری سەقەتی) فەرموی: مامۆستاگیان! هەر چەندە قسەکەشم بێ ئەدەبیە، بەلاّم توخوا تۆ کە بۆ خۆت هیچ لە قورئان نازانیت بۆ بە منداڵی خەڵکی دەڵێیت؟

مامۆستایەکە بەم قسەیە توڕە بوو و زللەیەکی لێدا.

(سری سەقەتی) فەرموی: مامۆستاگیان! نەزانینەکەت بەس نەبوو، ستەمیشت خستە پاڵ؟

---

١ـ تەفسیری ڕامان لەماناو مەبەستی قورئان، ئەحمەد کاکە محمود، لا ٤٩٥ .

٢ـ پوختەی تەفسیری قورئان، مەلا محمد مەلا صالح لا ٣١١ .

مامۆستا بیری لەم قسەیە کردەوە زۆر داچڵەکا، و داوای لێبوردنی لە مندالەکە کرد، و لای خوای گەورە تەوبەی کرد، تا وەکو خۆی باش فێر نەبێ خەڵکی تر فێر نەکات، خۆی لە منداڵی خەڵك نەکات بە مامۆستا، ئەمجا وازی لە مامۆستایەتی هێناو دەستی کرد بە خوێندن و هەمیشە دەیفەرمو: ئەو منالە ژیرە حەق گۆیە کە سری سەقەتیە، منی لە نەفامی ونەزانی ڕزگارکرد[1].

---

١ـ دین و ژین لە ژێر ڕۆشنایی ڕاسپاردەکانی رب العالمین، فاتح مەلا ڕەسول شارستێنی، لا ٢٨١)

# سەرگوزەشتەی بیست و دوو

# تۆ منداڵیت

زانای ناوداری ئیسلام حوسەینی کوڕی فەزڵ (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کاتێ مناڵ بوو، چوو بۆ خزمەت یەکێك لە خەلیفەکان، لەو کاتەدا خەلیفە ژمارەیەکی زۆر زاناو داناو پیاو ماقوڵی لەلا بوو، ئەویش منالێکی زیتەڵەو ژیرو بوێر بوو، حەزی کرد هەندێ قسە لەگەڵ خەلیفەدا بکات، و هەندێ کەم و کوڕی و داواکاری منالان هەبوو بیخاتە ڕوو، تاوەکو خەلیفە چارەسەریان بکات، بەڵام خەلیفە لێی توڕە بوو، وتی: تۆ منالی چۆن شەرم ناکەی لەبەردەم ئەم هەموو زانایەدا قسە دەکەی؟

(حوسەینی کوڕی فەزڵ)یش کە بە تەمەن منداڵ بوو وتی: ئەی خەلیفە خۆ ئەگەر منداڵیش بم ئەوا خۆ لە پەپو سلیمان (هُدهُد)ەکەی پێغەمبەر سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێ) بچوکتر نیم، و تۆش لە پێغەمبەر سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێ) گەورەتر نیت کاتێ پەپو سولەیمان پێی وت: ﴿ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴾. (سورة النمل: ٢٢).

پێغەمبەر سولەیمانیش(سەلامی خوای لێ بێ) گوێی بۆ قسەکانی ئەو باڵندە بچوکە گرت و بە قسەشی کرد.

کەواتە ئەی تۆ بۆ ناهێڵی من قسەت لەگەڵدا بکەم، و ئەوەی تۆ نایزانی، و من دەیزانم پێت بلێم؟

منالەکەش بەڵگەکەی زۆر بەهێز بوو، بۆیە خەلیفە بێ دەنگ بوو، پاشان وتی: ئەی منالْ فەرموو قسە بکەو گوێمان لێگرتووی [1]

---

١ـ دین و ژین لە ژێر ڕۆشنایی ڕاسپاردەکانی رب العالمین، فاتح مەلا ڕەسول شارستێنی، لا ٢٨١.

# سەرگوزەشتەی بیست و سێ[٧]

# کوشتنی (ئەسقف)

جارێکیان چەند منداڵێکی خەڵکی بەحرەین یاریان بە تۆپێك دەکرد، (ئەسقف) کە لە پلەی قەشە گەورەترە، و نەگەیشتۆتە پلەی (مەطران)، کە پیاوی ئاینی مەسیحی بەحرەین بوو لەوێ دانیشتبوو، لەناکاو تۆپێك بەر سنگی کەوت، ئەویش تۆپەکەی هەڵگرتەوە، منداڵەکان زۆر لێی پاڕانەوە کە تۆپەکەیان بداتەوە، ئەویش نەیدەدایەوە.

یەکێك لە مندالەکان وتی: داوات لێدەکەم لەبەر خاتری پێغەمبەرﷺ تۆپەکەمان بدەوە، بەڵام ئەو هەر نەیدەدانەوە، و جنێویشی بە پێغەمبەرﷺ دا، منداڵەکانیش لە تاوی خاتری پێغەمبەرﷺ بە دارەکانی دەستیان کەوتنە سەری، و ئەوەندەیان لێدا هەتا مرد، پاشان هەواڵەکە گەیشت بە پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ).

پێشەوا (عومەر) فەرمووی: سوێند بە خوا ڕزگارکردنی هیچ وڵاتێك، و دەستکەوتێکی گەورە بە ئەندازەی کوشتنی ئەو (ئەسقف)ە لەلایان ئەو منالانەوە عومەری دڵخۆش نەکردوە، پاشان فەرمووی: ئیسلام ئێستا سەربەرزو سەرفرازە منالانێکی بچوك، قسە بە پێغەمبەرەکانیان وترا لەسەری توڕەبوون، و سەرکەوتنیان بە دەست هێنا، و دوژمنی پێغەمبەری خوایان لەناو برد[١].

---

١ـ المستقرف فی کل فن مستکرف، شهاب الدین الآشبیهی.

# سەرگوزەشتەی بیست و چوار

## لەشکری موسڵمانان بەم قورئانەوە سەر دەکەوێت

مێژووی زێڕینی ئیسلام بۆمان دەگێڕێتـەوە کـە سـەرکردەیەکی پاڵـەوانی کـورد صـلاح الدین ئەیوبی (رەحمەتی خوای لێ بێ) جارێکیـان لـە گەرمـەی شـەڕدا بـەناو سـەربازگەی موسـڵماناندا هاتوچـۆی دەکـرد، و لەشـکرەکەی بەسـەر دەکـردەوە، لـەو کاتـەدا بـەلای خێمەیەکدا ڕەت بوو گوێی لە دەنگی قورئان خوێندن بوو، صـلاح الـدین ئـەیوبیش لەسـەر وڵاخەکەی هاتە خوارەوە، و تەماشای کرد وا منداڵێکی جوانکیلەی تازە زمان پژاو، لەسـەر ئەژنۆ لە خزمەت باوکی دانیشتووە، و قورئان دەخـوێنێ، (صـلاح الـدین ئـەیوبی)یـش زۆر خۆشحاڵ بوو، زانی خوای پەروەردگار بەبەرەکـەتی ئـەو منداڵـە پاکـە، و ئـەم باوکـە پـیرە دڵسۆزەی قورئان خوێنە، خوای گەورە لەشکری موسڵمانان سەر دەخات بەسەر کوفردا.

ئەمجا سەلامی لێکردن و لەلایان دانیشت و فەرموی: لە پاداشتی قورئان خوێندنی ئـەم قورئانە بڕیارمدا دەبێ هەموو نیوڕۆیەك ئەم منداڵە لەگەڵ خۆمدا نان بخوات، و فـلان بـاخ و بێستانم کە زۆر بە قیمەتە وەقف بێ لەسەر ئەم باوك و کوڕە قورئان خوێنە[1].

---

[1]ــ دین و ژین لە ژێر ڕۆشنایی ڕاسپاردەکانی رب العالمین، فاتح مەلا ڕەسول شارستێنی، لا ٢٩٥.

# سەرگوزەشتەی بیست و پێنج

## مەشاجیع ی کوڕی یوسف

(مەشاجیعی کوڕی یوسف) دەفەرموێ: لە شاری مەدینـە بـووم لای پێشەوا مالیـك لـە کاتێکدا فەتوای بۆ خەڵکی دەدا، (محمدی کوڕی حەسەن) کـە منـاڵێکی تـازە پێگەیـشتوو بوو لە پێشەوا مالیکی پرسی: چی دەڵێی دەربارەی کەسێك لەشـی پیـسەو ئـاوی دەسـت ناکەوێ خۆی پێ بشوات، ئاویش تەنها لەناو حەرەمی مزگەوتدا هەیە؟

پێشەوا مالیك فەرموی: مرۆڤی لەش پیس بۆی نیە بـچێتە مزگەوتـەوە، مناڵەکـە وتـی: ئەی باشە چی بکات لە کاتێکدا کاتی نوێـژ هـاتووە، و چاویـشی لـە ئـاوە لـەناو مزگەوتـدا هەیە؟

پێشەوا مالیك فەرموی: من دەڵێم نابێ لەش پـیس بـچێتە مزگەوتـەوە، بـەڵام مناڵەکـە چەند جارێك پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، ناچـار پێـشەوا مالیـك فـەرمووی: ئـەی باشـە چی بکات؟

مناڵەکە وتی: قوربان ئەو کەسە پێویستە لە دەرەوەی مزگەوتەکە تەیـەمموم بکـات، و پاشان بچێتە ناو مزگەوتەکەوە، و ئاو لە حەوزی ناو حەرەمی مزگەوتەکە بێنێتە دەرەوە، و پاشان لە دەرەوەی مزگەوتەکە خۆی بشوات و لەش پیسی لەسەر خۆی لاببـات، ئـەمجا نوێژەکەی بکات.

پێشەوا مالیك بەسـەر سورمانەوە وتـی: ئـەی منـاڵی چـاو گەشـی جـوان و زیـرەك تـۆ خەڵکی کوێی؟

مناڵەکە وتی: قوربان خـەڵکی ئێـرەم (بـە پەنجـەی دەستیـشی ئامـاژەی بـۆ زەویەکـە کرد)، پێـشەوا مالیـك وتـی: باشـە تـۆ کـە ئەوەنـدە زیرەکیـت چـۆن درۆ دەکـەیت دەڵێـی خـەڵکی مەدینـەم، بـەڵام مـن بـاش دەزانم کـە تـۆ خـەڵکی ئـەم شـارە نیـت و تـا ئێـستا نەمبینیویت؟

منداڵەکە وتی: قوربان من وتم: خەڵکی ئێرەم و دەستم بۆ زەویەکە درێژ کرد واتە: (لـەم خاکەوە دروست بووم) ئیتر درۆم نەکردووە، پێشەوا مالیك فەرموی: ئەم قسەیانت لـەوەی پێشتر عاقلآنەتر بوو، و زیاتر سەرنجی ڕاکێشام، بـە ڕاسـتی تـۆ ئەگـەر لەسـەر خوێنـدن بەردەوام بیت، ئەوا دەبیـت بـە زانایـەکی بـەناوبانگ، پاشـان منداڵەکـە لای پێشەوا مالیـك مایەوە تا کتێبی (موطأ)ی لە خزمەت پێشەوا مالیکدا خوێند، و لە کۆتاییدا بوو بە یـەکێك لەو دوو کەسە بەناوبانگەی کە مەزهەبی ئەبو حەنیفەیان زیندوو کردەوە کە (محمدو ئـەبو یوسف)ن، محمدیش منداڵەکە بوو[1].

---

١ــ دین و ژین لە ژێر ڕۆشنایی ڕاسپاردەکانی رب العالمین، فاتح مەلا ڕەسول، لا ٣١١.

# سەرگوزەشتەی بیست و شەش

# کابرای خورما فرۆش

(حارثی محاسبی) منداڵ دەبێ، ڕۆژێکیان بە لای هەندێ منداڵدا تێپەڕی کە لەبەردەم ماڵی خورما فرۆشێکدا یارییان دەکرد، ئەویش ڕاوەستاو سەیری منداڵەکانی دەکرد، خاوەن ماڵەکە هاتە دەرەوە، و هەندێ خورمای پێ بوو، بە حارثی وت: ڕۆڵە گیان! بۆ خۆت ئەم خورمایە بخۆ، حارث وتی، بۆچی ئەو خورمایانە چین؟

کابرا وتی: من خورمام لە پیاوێك کڕی هەندێك لە خورماکەی کەوتە خوارەوە، و منیش هەڵمگرتەوە، تۆ بۆ خۆت بیخۆ، حارث وتی: ئایا ئەو کابرایە دەناسیتەوە؟

وتی: بەڵێ حارث ڕۆیشت و ئەو ناوەی بەجێ هێشت، کابرای خورما فرۆش کەوتە شوێنی هەتا گرتی و پێی وت: بە خوا لە دەستم دەرناچیت هەتا ئەوەی کە لە ناخت دایە بەرامبەرم پێم نەڵێیت، حارث وتی: مامە پیرە، ئەگەر تۆ موسڵمانیت داوا لە خاوەنی ئەو خورمایانە بکە بیانباتەوە بۆ خۆی، تا ڕزگارت ببێ لە زیان و خراپەکاری، هەروەك چۆن کاتێ زۆر تێنوتە داوای ئاو دەکەی، و بە شوێن ئاودا دەگەڕێی، ئاواش داوا لەو کابرایە بکە کە بێت خورماکانی بەرێتەوە، ئەی مامە پیرە خۆت بە موسڵمان دەزانیت و خواردنی حەڕامیش دەرخواردی موسڵمانان دەدەیت؟[1].

١ـ دین و ژین لە ژێر ڕۆشنایی ڕاسپاردەکانی رب العالمین، فاتح مەلا ڕەسول، لا ٣١٩.

# سەرگوزەشتەی بیست و حەوت

﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴾

منالێك بوو تەمەنی لە (١٠)ساڵی تێپەڕی نەکردبوو، دشداشەیەکی لەبەر بوو بەدویدا دەخشا، ڕۆژێکیان بە لای ماڵی ستەمکارێکدا دەڕوات، لەو ساتەدا ستەمکارەکە لە پێش دەرگاکە دەبێت، منالەکەش سەلامێکی لیێ دەکات و پێی دەڵێت: (السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته) کابراش توڕە دەبێت و وەڵامی سەلامەکەی ناداتەوە، منالەکە پێی دەڵێت: دراوسێی خۆشەویستم بۆچی نایەیت بچین بۆ مزگەوت، دوو رکات نوێژ بۆ خوای پەروەردگار بکەین، کابراش توڕە دەبێت و دەڵێت: ئێستا کەی کاتی نوێژە دیارە تۆ گاڵتە بە من دەکەیت، تاکو ئێستا کەس نەیتوانیوە قسەم لەگەڵدا بکات تۆش گاڵتەم پێ دەکەیت، منالەکەش دەڵێت: دراوسێی خۆشەویستم سوێند بە خوا گاڵتەت پێ ناکەم، بەڵام لەگەڵم وەرە بۆ مزگەوت بچین دڵی خۆمان ئاو بدەین بە نوێژ، بە قورئان.. هتد، کابرای ستەمکاریش دەڵێت: خۆت باش دەزانیت من نوێژ ناکەم بۆچی بانگم دەکەیت؟

منالەکەش دەڵێت: تۆ لەگەڵم وەرە چیت ئەوێ من لە خزمەتتدا دەبم، کابرای ستەمکار یەکجار توڕە دەبێ دەڵێت: تۆ چیتە؟ نوێژی چی؟ کەی کاتی نوێژە ئێستا کاتژمێر (٩)ی بەیانیە، منالەکەش دەڵێت: دەچین (نوێژی چەشتەنگاو) دەکەین بۆ ئەوەی خوا بمانخاتە بەهەشت، بە هەر حاڵ کابرا لەگەڵ منالەکە دەچێت بۆ مزگەوت، ئەمجا منالەکە دەستی کرد بە نوێژی چەشتەنگاو، پاش کردنی نوێژی چەشتەنگاو منالەکە قورئانێکی هێنا بۆ کابرای ستەمکار، کابراش قورئانەکەی کردەوە یەکسەر ئەم ئایەتەی هاتە پێش چاو کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴾ یەکسەر کابرا کەوتە لەرزەو دەستی بە گریان کرد، و وتی: خوایە گیان! تەوبە بێ لەسەر دەستی ئەم منالە من

گەڕامەوە لای تۆ، دەبمە یەکێك لەوانەی کە تـۆ خۆشـت دەوێـن، پاشـان دەسـتی کـرد بـە گریان، پاشان وتی: پەروەردگار داوات لیٚ دەکەم لە کڕنوشدا بمرێنی بۆ ئـەوەی بگـەم بـە خزمەتت، ئاااى.. چەند خۆشە کەسێك بە ڕوو سپیەوە بگات بە پەروەردگار، ئەمجا چۆوە ماڵەوە دەشتی کرد بە گریان لەسەر ئەو تاوانەی کە ئەنجامی دابوو لـەوەو پـێش، پاشـان نوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و شێوانی کرد لە مزگەوت، پاشان بۆ نوێژی بەیانی بـەرەو مزگەوت چوو بۆ ئەوەی نوێژی بەیانی بە کۆمـەڵ بکـات، ئـەمجا پـێش نوێـژی مزگەوتەکـە دەستی کرد بە نوێژ کردن لە ڕکـاتی دووەم ئـەم ئایەتـەی خوێنـد کـە خـوای پـەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ﴾ زۆر گریا خۆی پیٚ ڕانەگیرا کەوتە سەر زەوی، بە هەر حاڵ هەستایەوە، پێش نوێژەکە کڕنوشی برد، ئەویش کڕنوشی برد، بەڵام لە کڕنوشی دوهەمدا هەڵنەسایەوە، کاتیٚ کە سەلامیان دایەوە تەماشا دەکەن کـابرا مـردوە، ئـەوانیش بە یەك دەنگ هاواریان کرد و ووتیان: (إنا لله وإنا إليه راجعون)[1].

---

١ـ موقع الإنترنيت: صيد الخاطر.

# سەرگوزەشتەی بیست و هەشت

## گەڕانەوەی حاجیەك

لەسەر یەکێ لە چیاکانی مینا کە(٣٠٠)م لە ئاستی دەریا بەرزە، بە تـەنیایی دانیشـت و چاوەکانی فرمێسکی گەرمی دەڕشت، لێی نزیك بووینەوە پرسیارمان لێی کـرد کـە بۆچـی ئاوا بە کوڵ دەگری و نـاوت چیە؟ وەڵامـی دامـەوە وتـی: نـازانم نـاوم چـیە؟ بـەس ڕۆژی عەرەفە لە دایك بوویمە.

ئەمجا وتی: ئەو وەڵامەی منتان پێ سەیر نـەبێ، چـونکە ئەمـە ڕاسـتیەکەیە، مـن (٢٠) سـاڵ ئـالودەی مـاددە هۆشـبەرەکان بـووم، لـەم (٢٠) سـاڵە تـەنیا هـاوڕێی حەبـەکانی کیبتاگۆن و حەشیشە و مەی بووم.

ئـەوەش سەرگوزەشـتەی (ئەلحـەڕبی: ٤٠ سـاڵ)ە، کـە بەسـەرهات و ڕووداوی زۆر بزوێنەرو غەمناکە، لـە هـەمان کاتـدا ئـەویش بـۆ (عکـاظ) دەگەڕێتـەوە، کـە چـۆن هـاوڕێ خراپەکانی ئەویان بەرەو ئەو هەڵدێرە نالەبارە برد.

(ئەلحەڕبی)دەڵێت: من باوکی پێنج مندالم (ڕامی، ڕیم، ڕەبیان، ڕەوان، ڕیهـام)، لەگـەڵ دایکم نیشتەجێ بـووم لـە ناوچـەی (ئەلقەصـیم)، شـوفێری بـار هـەلگربووم، و هاتووچـۆم دەکرد لە نێوان شارەکانی وڵات، ڕۆژێکیان یەکێك لە هاوڕێیانم کە ئەویش شوفێر بوو پێـی وتم: بۆچی حەبێکی هۆشبەر ناخۆی، چـونکە چـالاکت دەکـات، و وات لـێ دەکـات بتـوانی شەوان نەخەوی و بەرگەی ئەو سـەفەرە دوورو درێـژە بگـری.. یەکـەمین جـار ئـەم شـتەم ڕەتکردەوە، بەڵام ئەوەندە دووبارەی کردەوە هەتا هەموو ڕۆژ ئەو قسەیەی بـۆ دەکـردم، بە خۆشم نازانم چۆن ئەم حەبەم خوارد وەکو تاقیکردنەوەیـەك، ئەمـە سـەرەتای کەوتنـە خوارەوەم بوو بۆ دوای ئەمە بۆ ماوەی (٢٠) ساڵ هەموو ڕۆژێ دەمردم.

کاریگـەری ئـەم ژەهرانـە تـەنیا لەسـەر خـۆم نـەبوو، بـەڵکو بـۆ گـشت ئەندامـەکانی خێزانەکەم بوو، لە پێش چاوی منالەکانم ئـازاری هاوسـەرەکەم دەدا، ئـەو منالـە بـچوکانە ترس گشت لەشی دادەگرتن کە دەیانبینی باوکیان هەموو شەوێك دەبێتە دڕندەیەکی بـێ هەست و سۆز.

هەر چەند هاوسەرەکەم هەوڵیدا لەگەڵم واز لـەو مـاددە هۆشـبەرانە بێـنم، بـەڵام گـشت هەوڵەکانی بە فیڕۆ چوو، چونکە من بوومە مرۆڤێکی بێ هەست و تێنەگەیشتوو.

(حـەربی) کـەمێك وەسـتا لـە گێڕانـەوەی سەرگوزەشـتەکەی، خـۆی خـەریك کـرد بـە سڕینەوەی فرمێسکەکانی، ئەمجا هەناسەی هەڵکێشاو سەری خۆی نزم کـردو دەسـتی بـە قسەکانی کردەوەو وتی: ئێستاش ئەو ڕۆژەم لە بیرە هەر دەڵێی دوێـنێ ڕوویـداوە، کاتێـك هەندێ لە دراوسێکانمان هاتبوون بۆ سەردانمان لە ماڵـەوە، هـەر ئەوەنـدەم زانـی (ڕامـی) کوڕم هاتە لام و پارچەیەك حەشیشەی بـە دەسـت گرتبـوو کـە لـە سـیەکێکی ژوورەکـەی دۆزیەوە، و پرسیاری لێ کردم و وتی: وا دیارە ئەمڕۆ حەشیشەت نەخواردووە باوکە.

ئەم ڕۆژە ئاواتم بوو زەوی لەت بێ و قوتم بدات، دوای ڕۆیشتنی میوانەکان لەگەڵ خـۆم دانیشتم، و لۆمەی خۆم دەکرد لەو کاتە ڕامی (١٥) ساڵ و ڕیـم (١٤) سـاڵ لێیـان پرسـیم: باوکە گیان! تا کەی ناتوانین لەگەڵت دانیشین، و قـسەت لەگـەڵ بکـەین؟ تـا کـەی واز لـە خواردنی ئەو ژەهرانە ناهێنیٚ؟ کەی واز لە لێدان و ئازارەکانی دایکە سـتەم لێکراوەکـەمان دێنی؟

باوکە گیان! ئێمە تاوانمان چیە؟

ئـەو شـەوە خـەو نەچـووە چـاوانم، لـە ململانێیـەکی درێـژدا مامـەوە تـا حـەزەکانم بـە وازهێنان لە خواردنی ماددە هۆشبەرەکان، و نێوان هەوڵەکانی هاوڕێیە خراپەکانم بـە ڕازی کردنم و بە قەبوڵکردنی ئەو ماددە ژەهراویانە.

بەڵێ.. لەو ململانێیە ژیام بە هەموو ڕووداوەکانیەوە، تا خوای گەورە دوو پیاوی چاکی هێنایە سەر ڕێگام کە خەڵکی گەڕەکەکـەم بـوون، و منیـان لەسـەر ڕێگـای هـەق و چاکەو بەختەوەری دونیا و دوا ڕۆژ دانا.

ئێـستا مـن وا لـە زەویـە پیرۆزەکـانم و فـەرزی حـەج جێبـەجێ دەکـەم، و لـە خـوای پـەروەردگار دەپاڕێمـەوە لـەو تاوانانـەم خـۆش بێـت کـە لـەوەو پـێش کردومـە، ئـەو فرمێسکانەی ئێستا دەیانبینی فرمێسکی پەشیمانیە، لەوانەیـە ئـەو ژەهرانـە بشۆرێ کـە (٢٠) ساڵە لەناو خوێنم هاتوچۆ دەکەن.

دوای ئەو گفتۆگۆیە خوا حافیزیمان لە حەڕبی کردو جێمان هێشت، لەو کاتەی دەگریاو بە ملکەچی دەپاڕاوە و دەستی بۆ خوای بالآدەست و بەخشندە بەرزکردەوە، ئێمـەش لـە دڵمانەوە دۆعای بۆ دەکەین خوا تەوبەیەکی دڵسۆزی پێ بەخشی بێ.

بەڵێ.. ئەم دوو منالەم منیان بـەرەو ڕێگـای هیدایـەت نـارد، کـە پـەروەردەی دایکیـان بوون، داوا لە خوای میهرەبان دەکەم کە منالەکانمان خزمەتی ئایینی ئیسلام بکەن[١].

١ـ بعثة عكاظ، محمد مداري، المشاعر: الإثنين ١٤٢٥/١٢/١٤.. دموع التائبة، يوسف الحاج أحمد.

# سەرگوزەشتەی بیست و نۆ

## موسڵمان بوونی برای مایکل جاکسۆن

## ڕاگەیاندنی موسڵمان بوونم لە سعوودیە ئەندامانی خێزانمی لە ئەمریکا سەرسام کرد

خێزانی جاکسۆن ناوبانگیان دەرکردوە بە گۆرانی و میوزیك، جاکسۆنی باوك تیپێکی میوزیکی سەرکەوتووی پێکهێنا بۆ کوڕەکانی.

تیپی (جاکسۆن فایف) لە سەرتاوە یەکێك بوو لەسەرکەوتوترین تیپە میوزیکیەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو لە حەفتاکان ناوبانگیەکەی جیهانی پەیدا کرد.

(جێڕمن جاکسۆنی) برای مایکل جاکسۆن دەستی کرد بە گەشتە ئیمانیەکەی کە ڕێنمویی کرد بۆ ئیسلام، کاتێك سەفەری کرد بۆ وڵاتێکی وەکو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە یاوەری خوشکە گەورەکەی، لەوێ ئیسلامی ڕاستەقینەی ناسی لە دەمی منداڵەکان. (جێڕمن جاکسۆن) دەڵێ: لە کاتی سەردانی کردنم بۆ ژمارەیەك لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە یاوەری خوشکە گەورەکەم لە ساڵی (١٩٨٩)ز، یەکەمین جار سەردانی بەحرێنمان کرد، لەوێ لەگەڵ هەندێ منداڵ گفتوگۆم کرد لە شاری مەنامە، لە نێوان ئەم پرسیارانەی لە منیان کرد ئەو پرسیارە بوو: ئاینت چیە؟ منیش وتم: مەسیحیم. پاشان وتم: ئەی ئێوە ئاینتان چیە؟

بە یەك دەنگ وتیان: ئیسلام ئایینمانە، ئەوان بە شانازیەوە باسی ئاینەکەیان دەکرد.

(جێڕمن جاکسۆن) چیرۆکی موسڵمان بوونی خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: دوای گەڕانەوەم لە بەحرەین و قسەکردنم لەگەڵ ئەو منداڵانە، دڵنیا بووم من موسڵمان دەبم، لەگەڵ هاوڕێیەك قسەم کرد کە ناوی (علی قەنبەرە)بوو، باسی ئەو هەستەم بۆ کرد لە ناخمدا دەجولێتەوەو بە ڕاشکاوی پێم وت: حەزم لێیە زیاتر شارەزای ئیسلام بم.

بۆیە سەفەرم کرد بۆ سعودیە تا زیاتر ئیسلام بناسم، و هـەر لـەوێش موسـڵمان بـوونی خۆم ڕابگەیەنم.

(جێڕمن جاکسۆن) بەردەوام دەبێ لە قسەکانی و دەڵێ: لەگەڵ (علی قەنبەر)ی هـاوڕێم سەفەرم کرد بۆ شاری (ریاض) تا زیاتر شارەزای ئاینی ئیسلام ببم، لەوێش سـەفەرم کـرد بۆ (جدة)، لە (جدة) خێزانێکی سعودی ڕێزدار منیان برد بۆ ئەنجام دانی عومرە.

(جێڕمن جاکسۆن) باسی موسڵمان بوونی خۆی دەکات، و بـە لـە دایـك بـوونێکی نـوێی دادەنـێ و دەڵـێ: مـن چـەندین پرسـیارم هـەبوو کـە سەرسـامی کردبـووم دەربـارەی مەسیحیەت، و گەورەمان پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) بەڵام لە ئیسلام وەڵامـی وام بە دەست گەیشت کە تەواو دڵنیایی کردمەوە.

من سەرسام بووم وەکو مەسیحیەك بە تایبەتی دەربارەی ئـەو ئینجیلانـەی بـە دەسـت چەند کەسێکی ئاسایی نووسراوەتەوە.

بەردەوام پرسیارم دەکرد چۆن ئەو مرۆڤانە دەتوانن ئاگاداری وریـایی تـەواویان هـەبێ لە کاتی نووسینی ئەو ئینجیلانە؟ لە کاتێکدا خوای گـەورە قورئـانی پاراسـت بـە درێـژایی ئەو هەموو ساڵانە.

لە سعودیە چەندین کاسیەتی سەرنج ڕاکێشی گۆرانیبێژی بەڕیتانی پێشوو، و بانگـەواز خوازی ئیسلامی یوسف ئیسلامم دۆزیەوە، کـە گفتوگۆیـەکی تیـابوو دەربـارەی ئیـسلام و مەسیحیەت کە زۆر شتی فێرکردم.

(جێـڕمن جاکـسۆن) دەڵـێ: هەڵمـەتێکی ڕاگەیانـدنی خراپـەکار هەیـە لـەناو ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دژی ئیـسلام، سـەیر لەوەدایـە زۆر لـە ئەمەریکیـەکان بـاوەڕ بـەو ڕاگەیاندنـە دەکـەن، چـونکە شـارەزای ئیـسلام نـین، ئـەو شـێواندنەی ئـاینی ئیـسلام بـە شـێوەیەکی فـراوان و ئاراسـتە کـراوە، نـەك هـەر ئەوەنـدە، بـەڵکو هۆلیـۆد لـە فلیمـی موسڵمانەکان وا نیشان دەدات کە تیرۆرست و بکوژ و خراپەکارن.

(جێڕمن جاکسۆن) سەبارەت بە دەنگ دانەوەی موسڵمانبونی لە نێو ئەندامانی خێزانی

دەڵێ: دایکم لـە دەزگایـەکی ڕاگەیانـدن هـەواڵی موسـڵمانبونی مـنی زانـی، کـە گەڕامـەوە ئەمریکا دایکم پێی وتم: کوڕی خۆم ئەگەر تۆ باوەڕت بەم ئاینە هەیە دەستی پێوە بگـرەو بەردەوام بە لەسەری، منیش وتم: دایە گیان من باوەڕێکی تەواوم هەیە بەم ئایینە[١].

لە کۆتاییدا دەڵێم: خۆزگـەمان بـەم منداڵـە کـە بـە یـەك دەنـگ وتیـان بـە (جاکسۆن): ئایینمان ئیسلامەو شانازیان بە ئیسلام کرد.

---

١ـ دموع تائبە / یوسف الحاج أحمد .

# سەرگوزەشتەی سی

# ئیسحاقی قەشە

ناو: ئیسحاق هیلال مەسیحی قەشە.

کـار: چـاودێری کلێـسای میـسالی مەسـیحی و سـەرۆکی فـەخری کۆمەڵـەی (خـلاص النفوس)ی میسری لە ئەفەریقیاو ڕۆژئاوای ئاسیا.

لە دایك بووی: ١٩٥٣/٥/٣ – ئەلمینیا، لە میسر.

لە گوندی (بیاضەی) بنکەی پارێزگای ئەلمینیا لـە دایـك بوویمـە، لـە دایـك و بـاوکێکی نەصرانی ئەرسۆزوکس، دایکم و باوکم هەر لە منالێمانـەوە ڕق و کینـەیان لـە دڵمـان چاند دژی ئیسلام و موسڵمانان.

کاتێك دەستم کرد بە لێکۆڵینەوە لە ژیانی پێغەمبەران، ململانێیەکی فیکری لە ناخمدا دەستی پێکرد، پرسیارەکانیشم زۆر مشتومڕی دروست دەکرد لـە نێـوان قوتابیـان تـا وای لە پاپا شنۆدە کرد بڕیارێك دەربکات بە دامەزراندنم بە قەشە، پێش وادەکەی خۆم بە دوو ساڵ تا دەم کوتم بکـەن، چـونکە ئـەوان هەسـتیان دەکـرد کـە مـن پـشتگیری لـە ئیـسلام دەکەم.

هەر چەندە دەبێ بزانن کە بڕیار وابوو دانەمەزرێم تـەنیا دوای تێپەڕبوونی (٩) سـاڵ لـە دەست پێکردنم لە خوێندنی لاهوتی.

ئەمجا بووم بە سەرۆکی کەنیسەی میسالی مەسیحی، و دامـەزرام و بـووم بـە سـەرۆکی فەخری بۆ کۆمەڵەی (خلاص النفوس)ی میسری، ئەویش کۆمەڵەیەکی بە نەصرانی کردنـی زۆر بەهێزەو ڕەگی داکوتاوە لە زۆربەی وڵاتە عەرەبیەکان بە تایبەتی وڵاتانی کەنداو.

پاپا بەردەوام پارەی پێ دەبەخشیم تا نەگەڕێمەوە گفتوگـۆ کـردن و دەرخـستنی ئـەو بیرۆکانەی کە هەمە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر تامەزرۆ بووم بۆ زانینی هەقیقەتی ئیسلام، هەرگیز ئەم ڕووناکیە لە دڵم کز نەبوو بە هۆی ئەم پلـەو پایـە نوێیـەم، بـەڵکو زیـاتر بـوو، هەروەها پەیوەندیم لەگەل هەندێ لە موسڵمانان بە نهێنی دەستی پێکردو دەستم کـرد بـە خوێندن و لێکۆڵینەوە لە ئاینی ئیسلام.

داوام لێکرا نامەیەکی ماستەر ئامادە بکەم لە بەراوردکردنی نێوان ئایینـەکان، ئـەوەی سەرپەرشتی ئەو نامەیەی دەکرد ئەسقوفی لێکۆڵینەوەی زانستی بوو لـە میسر، لـە ساڵی (١٩٧٥)ز چوار ساڵم پێ چوو تا ئەم نامەیەم ئامادە کرد، سەرپەرشتیاری نامەکـە زۆر بـە دژی ئەوە بوو کە نامەکەم دەربارەی ڕاستی پێغەمبەرایـەتی ﷺ و نەخوێندەواریەکـەی و موژدەی پێغەمبەر عیسی (سەلامی خوای لێ بێ) نووسی.

لـە کۆتاییـدا تـاوتوێکردنی نامـەی ماسـتەرەکەم تـەواو بـوو لـە کڵێسای ئـەنکلیکی لـە قاهیرە، و گفتوگۆکە بۆ ماوەی چوار کاتژمێر بـەردەوام بـوو، بـە تایبـەتی لەسـەر بابـەتی پێغەمبەرایـەتی ﷺ و ئامـاژە کـردن بـۆ ئـەو ئایەتانـەی کـە بـە ڕاشـکاوی ئامـاژە بـە پێغەمبەرایەتی ﷺ دەکات، و کۆتایی هاتنی پێغەمبەرایەتی بە هاتنی ئەو ڕێزدارە.

لە کۆتایی بێ گفتوگۆ پاپا بڕیاریـدا نامەکـەم لـێ بکێشێتەوە، و دانـی پیانـەنێ، دوای ئەمە بیرێکی قوڵم کردەوە لە ئاینی ئیسلام تا هیدایەت بوونەکەم بە دڵنیاییەکی تەواو بێ، بەڵام کتێبە ئیسلامیەکانم دەست نەدەکەوت، چونکە پاپا پاسەوانیەتی توندی خستە سەر من و کتێبخانە ئایینیەکەم.

هیدایەت و ڕێنموییم بەسەرهاتێکی هەیە بە کورتی باسی دەکەم:

لە ڕۆژی شەشەمی مانگی هەشتەمی ساڵی (١٩٧٨)ز دەچوم بۆ زیندوکردنـەوەی یـادی لە دایك بوونی مەریـەمی پـاك لـە ئەسـکەندەریە، و سـواری ئـەو شـەمەندەفەرە بـووم کـە کاتژمێر(٣/١٠) خولەك بەڕێ دەکەوێ لە ئێزگەی ئەسیوت کە بەرەو قاهیرە دەڕۆیشت.

دوای گەیشتنی شەمەندەفەرەکە نزیکەی کاتژمێر (٩/٣٠) سواری پاس بووم لە ئێزگەی عەتەبە ژمارە (٦٤) کە بەرەو عەبباسیە دەڕوا، لـەو کاتـەی لـەناو پاسـەکە بـووم و جلـی ئـاینیم لەبـەر بـوو، و خاچـێکی زێـڕم لـە مـل بـوو کـە قوڕسـیەکەی (٢٥٠) غـڕام بـوو، گۆچانەکەم بە دەستەوە بوو.

مناڵێکی تەمەن (١١) ساڵی سواری پاسەکە بوو، بۆ فرۆشتنی چـەند نامیلکەیـەك، ئـەم مناڵە نامیلکەکانی دابەش دەکرد بەسەر گشت ئەوانەی لەناو پاسـەکەن، تـەنیا مـن نـەبێ،

لە دڵی خۆمدا وتم بۆچی ئەم منداڵـە ئـەم نامیلکانـەی دا بـە گـشت ئەوانـەی نـاو پاسـەکەن تەنیا من نەبێ، دوای ئەوە چاوەڕێم کرد تا لە دابەش کردنەکە تەواو بوو، ئەوەی فرۆشتی فرۆشتی، ئەوەی ماوەش کۆی کردەوە.

بە منداڵەکەم وت: کوڕەکەم بۆچی نامیلکەکانت بە هەمووان دا تەنیا من نەبێ؟

منداڵەکە وتی: لەبەر ئەوەی تۆ قەشەیت؟

لـەم کاتـەدا هەسـتم کـرد مـن شـایەنی هـەڵگرتنی ئـەو نامیلکانـە نـیم، هـەر چـەندە بچوکیشن.

بۆیـە زۆر داوام لێکـرد نامیلکەیـەکم پـێ بفرۆشـێ، بـەڵام ئـەو بـە تونـدی ئەمـەی ڕەت کردەوەو وتی: نەخێر ئەمانە کتێبی ئیسلامین، ئەمجا بە پەلە چووە خوارەوە.

لەگەڵ هاتنە خوارەوەی ئەو منداڵە لە پاسەکە هەستم کـرد مـن برسـیم، و ئـەو کتێبانـە تێرم دەکەن، تێنومە ئەو کتێبانە تێنوتیم دەشکێنن.

یەکسەر هاتمە خوارەوەو دوای منداڵەکە کەوتم، ئەویش ڕای کرد لە ترسان، ئەو کاتە لـە بیرم چوو من کێم و ڕامکرد بە دوای منداڵەکە تا دوو کتێبم لێ سەند.

کاتێك گەیشتمە کڵێسای گـەورە لـە عەبباسـیە (کاتدرائیـەی مەرقوسـی) چـومە ژووری نوستنی تایبـەت بـە داوەت کـراوە فەرمیـەکان، زۆر مانـدوو بـووم لـە سـەفەرەکەم، بـەڵام یەکێك لەو دوو کتێبەم دەرهێنا کە (جزء عم) بـوو و کردمـەوە، چـاوم کـەوت بـە سـورەی ئیخلاص، کە وشەکانم خوێندەوە ئەقڵی بە ئاگا هێنام و جەستەمی هەژاند.

دەستم کرد بە دووبارە کردنەوەی تا لەبـەرم کـرد، لـە کـاتی خوێندنـەوەی هەسـتم بـە حەوانەوەیەکی دەرونی کـردو ئـارامی و خۆشـیەکی زۆری بـە ڕۆحـم بەخـشی، لـەو کاتـادا یەکێك لە قەشەکان هاتە ژوورەوەو بانگی کردم باوکمان ئیسحاق، منـیش هاتمـە دەرەوەو هاوارم کرد بە ڕووی و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ﴾م خوێند، بێ ئەوەی هەسـت بکـەم چـۆن ئـەم کارەم کرد.

دوای ئەمە چوم بۆ ئەسکەندەریە بۆ زیندوکردنەوەی هەفتەی لە دایك بـوونی مەریـەمی پاك لە ڕۆژی یـەك شـەممە، لـە نوێـژی ئاسـایی قـودداس، لـە کـاتی پـشوەکەم چـووم بـۆ کورسی دان پیانـان تـا گـوێم لـە دان پیانـانی گـەلی نـەزان بـێ، کـە بـاوەڕی وایـە قەشـە دەتوانێ لە گوناهەکان خۆش بێ.

ئافرەتێك هات و پەشیمانی پێوە دیار بوو و وتـی: مـن (٣) جـار لـە ڕێـی پـاکم لاداوەو ئێستاش بەرامبەر زاتی پیرۆزی تۆمە، دان بەوە دادەنێم، و تکـام وایـە لـێم خـۆش بیـت و پەیمانت پێ دەدەم نەگەڕێمەوە سەر ئەو تاوانە.

نەریتی باو ئەوە بوو کە قەشەکە خاچەکەی بەرز بکاتەوە بە دەم و چـاوی ئـەو کەسـە دابێنێ و لە گوناهەکانی خۆش بێ.

هەر کە خاچەکەم بەرز کردەوە تا لە گوناهی خۆش ببم، یەکسەر ئەم ئایەتـە قورئانیـە هاتــە بـیرم کــە خـوای گــەورە دەفـەرموێت: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ بۆیـە قـسەم لـە دەم دەرنەچوو و زۆر بە کوڵ گریام و وتم: ئەمە هاتۆتە لام تا لە گوناهەکانی خۆش بم، کـێ لـە گوناهەکانی من خۆش دەبێ لە ڕۆژی سزاو پاداشت دانەوە؟

لێرە دەرکم کـرد کـە گەورەیـەك هەیـە لـە هـەموو گـەورەکانی تـر گـەورەترە، ئـەویش خوایەکی تاك و تەنیایە.

یەکسەر چووم بۆ چاوپێکەوتنی ئۆسقۆف و پـێم وت: مـن لـە گونـاهی خـەڵکی ئاسـایی خۆش دەبم، جا کێ لە گوناهەکانم خۆش دەبێ؟ ئۆسقۆف وتی: پاپا.

وتم: ئەی کێ لە گوناهەکانی پاپا خۆش دەبێ؟

لەو کاتەدا ئۆسقۆف تـووڕە بـوو هـاواری کـرد و وتـی: تـۆ قەشـەیەکی شـێتی، ئـەوەی تۆشی لەو پلەو پایە داناوە ئەگەر پاپاش بێت شێتە، چونکە پێمـان وت: ئـەو کەسـە لـەو پلـەو پایـە دامـەنێ، چـونکە گـەل خـراپ دەکـا بـە بـیرە ئیـسلامیەکان، و بیرۆکـە لارو خراپەکانی.

دوای ئەمــە بڕیـاری پاپـا دەرچـوو بـە بەنـدکردنم و منیـان بەچـاو بەسـتراوی بـرد بـۆ بەندیخانە، لە بەندیخانە قەشەکان بـە جۆرەهـا ئـازارو ئەشـکەنجە پێـشوازیان لـێ کـردم، لەگەڵ ئەوەی هێشتا موسڵمان نەبوو بووم، هەر یـەك لـەم قەشـانە دارێکـی هـەڵگرتبوو، و لێی دەدام و دەیوت: ئاوا لەو کەسە دەکەین ئایین و کڵێسای خۆی بفرۆشێ.

گشت شێوازەکانی ئازار و ئەشکەنجەیان لەگەڵم بەکار هێنا تا وەکو ئێستا شـوێنەواری لەسەر جەستەم ماوە، و باشترین شایەتە لەسـەر ڕاسـتی قـسەکانم، تەنانـەت ڕەوشـتە نـا مرۆڤایەتیەکەیان گەیشتە ئەو ڕاددەیەی (٩٧) ڕۆژ، ڕۆژانە(٧) جار داری گەسك بخەنە نـاو کۆمم، هەروەها ناچاریان کردم بەراز بەخێو بکەم.

دوای (٣) مانگ منیان بردە لای گەورەی قەشەکان بۆ ئەوەی لـەڕوی ئایینیـەوە تـەمێم بکات، کە چوومە لای پێی وتم: کوڕی خۆم خوای گەورە پاداشتی ئەو کەسە ون ناکات کە چاکە دەکات، ئارام بگرەو داوای پاداشت لە خوا بکـە، ئـەوەی لـە خـوای گـەورە بترسـێ خوای گەورە ڕزگاری دەکات.

لـە دڵـی خۆمـدا وتم: ئــەو قــسانە لــە کتــێبی پــیرۆز نــەهاتووەو لــە قــسەی پیــاوە پیرۆزەکانیش نیە، هەر لە سەرسامی خۆم بووم بە هۆی ئەو قسانە تا خوای گەورە هەق و ڕاستەقینە ئاشکرا دەکات هەر چەند ماوەکەش درێژ بێت، لـە دڵـی خۆمـدا وتم: مەبەسـتی گەورەی قەشەکان چیە لەو قسانە؟

بەڵام کاتێکی زۆری پێ نەچوو لە قسەکانی گەیشتم، بەیانیـەك لـە دەرگـای ژوورەکـەی گەورەی قەشەکەمدا تا هەڵسێ لە خەو، بەڵام لـە کردنـەوەی دەرگاکـە دوا کـەوت، منـیش پاڵم بە دەرگاکە ناو چوومە ژوورەوە، بە ڕاسـتی شـتێکی زۆر سـەر سـوڕهێنەرم بـینی کـە بوە هۆی ڕێنموویی من بۆ ئاینی ئیسلام، ئاینی یەکتاپەرستی، کە پیاوێکی گەورەی ڕیـش سپی تەمەنی (٦٥) ساڵیم بـینی وەسـتاوە، و نوێـژی موسـڵمانان ئـەنجام دەدات (نوێـژی بەیانی).

کە ئەو دیمەنەم بینی ماوەیەك بێ جولـە وەسـتام، بـەڵام زوو ئاگاداربوومـەوەو ترسـام یەکێك لە قەشەکان بیبینێ، بۆیە یەکسەر دەرگاکەم داخست.

دوای ئەمـە هاتـە لام و پێـی وتم: کـوڕی خـۆم ئـەم نهێنیـە داپۆشـە خـوا گوناهـەکانت دادەپۆشێ، ئەوە (٢٣) ساڵە بە نهێنی موسڵمان بوومە، قورئان و پەرستنی خـوای گـەورە هاودەم و هۆگری منن لە تەنیایم.

دوای چەند ڕۆژێك فەرمانی پاپا دەرچوو بە گەڕانەوەم بۆ کلێساکەم و گواسـتنەوەم لـە سوهاج بۆ ئەسیوت، بەڵام ئەو هەستانەی لەگەڵ خوێندنی سـورەی (ئـیخلاص) و کورسـی دان پیانان، گەورەی قەشەکان کە (٢٣) ساڵە بە نهـێنی دەسـتی بـە موسـڵمان بوونەکـەی گرتووە، زۆر کاری تێکردم بەڵام چی بکەم لەو کاتەی گەمارۆ دراوم لە کەس و کارو خزم و هاوسەرم، قەدەغەیە لە کلێسا دەرچم بە فەرمانی شنۆدە.

دوای تێپەڕ بوونی ساڵێك نامەیەکم بۆ هات لە کلێسا تیایدا شنۆدە فەرمانم پێ دەکـات کە ببم بە سەرۆکی ئەو لیژنەیەی کە بۆ سودان بەڕێ دەکەوێت، لـە گەشـتێکی بانگـەوازی بـۆ مەسـیحیەت، بۆیـە چـووم بـۆ سـودان و سـێ مـانگ لـەوێ ماینـەوە، بـە گـوێرەی ڕێنماییەکانی پاپا هەر کەسێ بە هۆی ئەو لیژنەیە ببێتـە نەصـرانی (٣٥) هـەزار جونـەیهی میسری پێ دەدرێ جگە لە یارمەتیەکانی تر.

ژمارەی ئەو کەسانەی لە خشتە بـران بـە هـۆی لیژنەکـەمان لـە ژێـر هـەژاری و نـەبونی (٣٥) سودانی بوون لە ناوچەی (واو) لە باشووری سودان.

دوای ئـەوەی ئـەم بـڕە پارەیـەم پێـدان پەیوەنـدیم بـە پاپـا کـرد لـە موترانیـەی (أم دەرمان)، ئەویش وتی: بیانبەن بۆ شوێنە پیرۆزەکانی مەسیحیەکان لە میسر.

ئەو (٣٥) کەسەمان دەرهێنا لە میسر بە بیانووی ئەوەی بۆ کـارکردن لـە دێرەکـان بـۆ لەوەراندنی وشترو مەڕو بەرازەکان، ئەمجا چەند ڕێککەوتنامەیـەکی کـارکردنی سـاختەمان بۆ ڕێکخستن تا لیژنەکە بتوانێ لەسودان بیانهێنێتە دەرەوەو بەرەو میسریان ببات.

کە گەشتەکەمان کۆتایی هات و لە کاتی گەڕانەوەمان لـە پـاپۆڕی (مارینـا) لـە ڕوبـاری نیل هەڵسام بەسەردانی کردنی ئەو دێیە نوێیانە، کاتێك دەرگای کابینەی (١٤)م کـردەوە، بە کلیلـی تایبـەت بـە دەسـتەی کـارکردنی سـەر پاپۆڕەکـە سەرسـام بـووم، بـەو پـاپۆڕە نوێیەی کە ناوی گۆڕا بوو بۆ (عبدالمسیح)، کە پێـشتر نـاوی محمـد ئـادەم بـوو، سەرسـام بووم کاتێك بینیم دەستی گرتووە بە عەقیدە ئیسلامیەکەی، و پارە نەیتوانی لـە خـشتەی ببات و ماڵی دونیا کاری تیَ نەکرد بۆیە جێم هێشت.

دوای کاتژمێرێك یەکێکم نـارد بـە دوای (عبدالمـسیح)، ئـەویش هاتـە لام و لـێم پرسـی: بۆچی نوێژی موسڵمانان ئەنجام دەدەیت دوای نەصرانی بوونت؟

لە وەڵامدا وتی: من جەستەم فرۆشـتوە بـە ئێـوە بەرامبـەر پارەکـەتان، بـەڵام گیـان و ئەقلّم مـوڵکی خـوای تـاك و تەنیایـە، ئەگـەر گەنجینـەی هـەموو دونیـام پـیَ بـدەن پێتـان نافرۆشم، لە پێش تۆش شایەتی دەدەم و دەڵێم: (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمـداً رسول الله).

ئەم هەموو ڕووداوانە ڕێگەی بۆ ڕوونـاك کردمـەوە، ڕێگـای مناڵەکـە کـاتیَ نامیلکەکـەی نەدامیَ، ڕێگای قەشەکە کە نوێژی بەیانی ئەنجام دەدا لە کڵێسا.

دواتـر منـیش چـوومە بەڕێوەبەرایـەتی ئاسـاییش و موسـڵمان بـوونی خـۆم ڕاگەیانـد، بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش چەند قەشەیەکی بـانگ کـرد تـا گـویَ بگـرن لـە قـسەکانم، بـەڵام قەشەکان هەڕەشەیان لێکردم بەوەی ئەگەر بێت و موسڵمان بم ئەوا گشت موڵك و سـامان و پارەم لیَ دەسێنن، دوای ئـەم هەڕەشـە توندانـە هـەموو شـتێکم بـۆ جێهێـشتن، چـونکە گشتیان ناگەنە ئەو ساتە پەشیمانیەی هەستم پیَ کرد لەسەر کورسی دان پێداهێنان.

دوای ئەمە کڵێسا بووە دوژمنی من و خوێنی منی بە فیڕۆدا، ئەمجا براکەم و ئامۆزاکـانم (٣) جـار ویـستیان تـیرۆرم بکـەن، و تەقـەیان لـیَ کـردم لـە قـاهیرە، تەقەیـەك بـە بـەر گورچیلەی چەپم کەوت،و بووم بە خاوەنی یەك گورچیلە.

هەرچەندە دڵم بە گورچیلەکەوە نیە، بەڵکو دڵم بە ئاینی ئیسلامەوە هەیە، چونکە ئیسلام وەڵامی هەموو پرسیارەکانی داومەتەوە.

لە کۆتاییدا دەڵێم: خۆزگەمان بەم منداڵەی کەوا ئەم نامیلکەی نەدا بەم قەشەیە، چونکە باوەڕی پێی نەبوو، لە هەمان کاتدا نەدانی ئەم (جزء عم)یە بووە هۆی موسڵمان بوونی ئەم قەشەیە، منداڵەکەش دەیزانی نابێت کەس دەست لەو جوزئە بدات [١]، تەنها موسڵمانی پاك و خاوێن نەبێت، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴾. ((سورة الواقعة، الآية: (٧٩)).

---

١ـ دموع التائبه، يوسف الحاج أحمد .

# سەرگوزەشتەی سی و یەك

## کۆتایی دونیا پەرستان

هاڕونە ڕەشید پێش ئەوەی ببێ بە خەلیفەی موسڵمانان کوڕێکی زۆر چاکی ئەبێ بە ناوی (منصور)، هەر لە کۆڕی زانایان و خواناسان و پیاوچاکان دادەنیشت، هەروەها بۆ یادکردنەوەی خوداو مردن ئەچوو بۆ سەر گۆڕستان، و جار جاریش قسەی لەگەڵ مردووەکان دەکرد، و دەیوت: ئیوە پێش ئێمە نەك هەر لە دونیا بوون، بەڵکو خاوەنی ماڵ و منداڵ و دارایی و سەروەت بوون، بەڵام مردن لە جیهانی بێ وەفادا ماوەی نەدان بە هەموو ئاواتێك بگەن، دیارە مردن و دونیا بۆ هەموو کەس وایەو بە هەزاران ئاوات و خەیاڵەوە دەیباتەوە، بەڵام خۆزگە ئەم زانی چیتان بەسەر هاتووەو چیان لێ پرسیون؟ چیتان وەڵام داوەتەوە، هەموو ڕۆژێ چاو پێکەوتنی جەنازەو هاوارو گریانی ژنان من ئەترسێنێ، ئەمەش ئاگادارکردنەوەی منە کە ڕۆژێ ئەبێ بێم بۆ لاتان.

ئەم کوڕە خواناسە کاتێ باوکی بوو بە خەلیفەی موسڵمانان ڕۆژێ چوو بۆ بارەگای باوکی کە چەند پیاوی گەورەو وەزیری لێ بوو، کار بەدەستانی خەلیفەش سەیریان دەکرد، جل و بەرگی ئەم کوڕە لە جل و بەرگی خەلیفە ناچێت، ئەگەر بەم شێوەیە ئەم کوڕە هاتوو چۆی کۆشکی خەلیفە بکات لەوانەیە لەناو خەڵکدا لە نرخی خەلیفەدا دابەزی.

کاتێ خەلیفە گوێی لەم قسانە بوو بە کوڕەکەی وت: کوڕم تۆ منت لەبەر چاوی خەڵك سوك کردوە، کورەکەیش هیچ وەڵامی باوکی نەدایەوە، باڵندەیەك کە بەسەر دیواری کۆشکەکەیەوە نیشتبوو بانگی کردو وتی: بە هەقی ئەو کەسەی تۆی دروست کردووە وەرە لەسەر دەستم بنیشە، ئەو باڵندەیە دەست بەجێ هات و لەسەر دەستی (منصور) نیشتەوە پاشان بە باڵندەکەی وت: بچۆرە سەر جێگەی خۆت، ئەمجا باڵندەکە هەڵفڕی و چووە سەر ئەو جێگەیەی ئەوسای، ئەمجا ڕووی کردە باوکی و وتی: باوکە گیان! ڕاستیو

هەقیقەت ئەمەیە كەوا پەیوەندی ئێوە بە دونیاوە منی لای خوا ڕیسوا كردوە، لەبەر ئـەوە من بڕیارم داوە لە ئێوە جیا ببمەوە، ئەمـەی وت و هەڵساو چـوو بـۆ ماڵـەوە، قورئـانێكی هەبوو و هـەڵیگرت، دایكیـشی ئەنگوسـتیلەیەكی بـە نرخـی هـەبوو دای پێـی وتـی: ئەگـەر پێویستیت بە پارە هەبوو بۆ خۆت بیفرۆشە، ئیتر ئـەوێی بـەجێ هێـشت و ڕۆیـشت بـەرەو شاری (بەصرە)، كاتێ گەیشتە ئـەو شـارە لـەوێ بەرنامـەی بـۆ خـۆی دانـا بـەم شـێوەیە هەموو ڕۆژێكی شەممە كاری دەكردو ڕۆژەكانی تر خواپەرستی دەكردو قورئانی دەخوێند، (ئەبو عامیری بەصری) دەڵێ: خانووی ماڵەكـەم پێویـستی بـە چـاكردنەوە هـەبوو، بینـیم كـوڕێكی زۆر جـوان دانیـشتووەو قورئـانێكی پێیـە، و زەمیلەیـەكی لای خـۆی دانـاوە كـە هەندێ شتی تیا بوو، ئەم كوڕە خەریكە قورئان دەخوێنێ منیش بۆ كرێكار دەگـەڕێم پـێم وت: كوڕە بچكۆڵە ئەرێ كار ناكەیت؟

وتی: بۆچی كار ناكەم، مرۆڤ بۆ ئەوە هاتۆتە سەر دونیا بۆ ئەوەی كـار بكـات بفـەرموو بزانم چ كارت هەیە؟

وتم: كاری چاككردنی ماڵم هەیە، (منصور) وتی: باشـە مـن دێـم لەگـەڵت بـەڵام بـە دوو مەرج:

١- من ڕۆژی تەنها شەش دیرهەم وەردەگرم.

٢- لە كاتی نوێژەكان كار ناكەم.

(ئەبو عامیری بەصری) دەڵێت: منیش هەردوو مەرجەكانیم قەبوڵ كرد، جا لەگەڵ خۆم برد بۆ ئەوەی كارم بۆ بكات كاتێ چووە سەر كار هەتا ئێوارە نەچووم بۆ لای كاتێ بانگی شێوان سەیرم كرد، ئەوەندە كاری كردووە بە ئەندازەی شەش كەس منیش سەرم سوڕما، بە هەر حاڵ ویستم لـە هـەقی خـۆی زیـاتری بـدەمێ، بـەڵام لـە هەقەكـەی خـۆی زیـاتری وەرنەگرت و یەكسەر ڕۆیشت.

بۆ بەیانی ڕۆیشتم بۆ ئەوەی کرێکارێك پەیدا بکەم و لە دوای ئەو منالە گەڕام کە بیبینم بـەلاّم نەمدۆزیـەوە، پرسـیارم کـرد لـە خـەڵکی ئـەویٚ کـرد کـە کـوڕێکی لـەم شـێوەو لـەم ڕەنگەتان نەدیوەو نەهاتۆتە ئێرە؟

خەڵکەکە وتیان: ئـەو کـوڕە تـەنها ڕۆژی شـەممان کـار دەکـات و ڕۆژەکـانی تـر کـەس نایبینێت، چونکە کارەکـەی ڕۆژی پێشووی چـاك بـوو، منـیش کارەکـەم دوا خـست هـەتا ڕۆژی شەممەی داهاتوو، ڕۆژی شەممە ڕۆیشتم لە هەمان جێگە دۆزیمـەوە، پاشـان بـە دوو مەرجەکەی پێشتر پێك هاتین، ئەمجا هاتە سەر کارو دەستی کرد بە کارکردن، بۆیە منیش زۆرم بە گرنگ زانی، چۆن ئەم کوڕە ئەوەندەی (١٠) کەس ئیش دەکات، بۆیە لە جێگایەك خۆم لێداگرت هـەتا بـزانم چـۆن کـار دەکـات، کـاتیٚ تەماشـام کـرد، خـۆی تـەنها جێگـەی خشتەکان چاك دەکات، ئیتر خشتەکان خۆیان یەك لە دوای یەك ڕێز دەبەستن، و دەبن بە دیوار، بۆم دەرکەوت ئەم کوڕە یەکێکە لە پیاوانی خوا.

ئەمە کارێکە فریشتەکانی خوا یارمەتی دەدەن، لە دوای تـەواو بـوونی کـار ویـستم (٣) دیرهەمی زیادی بدەمیٚ، بەلاّم لێی وەرنەگرتم، و وتی: من تەنها هەقی خۆمم دەویٚ، ئەمجا پارەکەی وەرگرت و ڕۆیشت، هەتا شەممەی داهاتوو چاوەڕێم کرد، دیار نـەبوو چـووم بـۆ ئەو جێگەی کە کاری تیا دەکرد لەوێش نەبوو، پرسیارم کرد لـە خـەڵك وتیـان: سـیٚ ڕۆژە نەخۆشە لـەناو فـلاّن دارسـتان دایـە، هەرچـۆن بـوو خـۆم گەیانـدە نزیکـی و سـەیرم کـرد خشتێکی کردووە بە سەرین، و ڕاکشاوە سەلامم لیٚ کرد هیچ وەلاّمی نەدامەوە، چونکە بیٚ هۆش کەوتبوو، دووبارە سەلامم لێکردو چاوێکی هەڵبڕی و ناسیمیەوە، ئیتر منـیش چـومە لای و سەریم کردە سەر ڕانم، بەلاّم سـەری خـۆی لابـردو وتـی: دۆسـتی مـن تـەمـەن تـەواو دەبێت و نازو نیعمەتەکانیش کۆتایی دێت، هەر کاتیٚ جەنازەیەکت بینی یان هەڵت گرت بۆ گۆڕستان، بـیر بکـەرەوە کـە ڕۆژێـك دێـت تـۆش ئـاوا دەبـەن بـۆ گۆڕسـتان، پـاش ئـەم ئامۆژگاریانە ڕووی تێکردم و وتی: ئەگەر مردم پاك بمشۆ و لەم جل و بەرگانەی خۆم کفنم

بکە، منیش وتم: ئەی خۆشەویستم جا چی ئـەبێ ئەگـەر پارچـەی تـازەت بـۆ بهێـنم، خـۆ مردن شایەنترە لە زیندوو بۆ بەرگی تازە.

منالّەکە وتی: ئەی ئەبو عامیر زیندو لە پێشترە بۆ بەرگی تازە، چـونکە کفـن کـۆن بـێ یان تازە جیاوازی نیە، و هەر دەچێتە ژێر خـاك و هـەردووکی ئەپۆشـرێ، ئـەوەی بـەکاری مرۆڤ بێت تەنها کردەوەی چاکە، چونکە ئەمە ئامۆژگاری ئەبوبـەکری صـدیقە، هـەر کـاتێ مـردم ئـەم مێـزەرەو ئـەم مەسـینەیەم بـدە بـەو کەسـەی کـە ئەمـشۆرێ و گۆڕەکـەم بـۆ هەڵدەکەنێ، ئەم ئەنگوستلەیەش لەگەڵ قورئانەکەم بگەیەنـە دەسـتی هاڕونـە ڕەشـید بـۆ یادگاری، ئەبێ خۆت بە دەسـتی خـۆت بیدەیتـە دەسـتی و پێـی بڵێیـت: ئەمـە ئەمانـەتی کوڕێکی نەناسە داویەتیە دەستم هەتا بیدەم بە تۆو پێشت بڵێم: نەوەك و لـەم کاتـەدا کـە دیلی بێ ئاگایی دوچاری مردن ببیت، ئەمەی وت و گیانی پـاکی بـەرەو ئاسمـان هـەڵفڕی، منیش لەسەر وەسیەتی منالّـە دوای دەفـن کـردن، قورئـان و ئەنگوسـتیلەکەم هـەڵگرت و ڕۆیشتم بەرەو شاری بەغدا، کاتێ نزیکی کۆشکی خەلیفە بووم، تەماشام کرد خۆی و پیاو ماقولّان و چەند وەزیرێك بـەرەو دەرەوە دێـن، منـیش هـەر چـۆن بـوو خـۆم گەیانـدە لای خەلیفـەو وتم: ئـەی خەلیفـەی موسـڵمانان کـوڕێکی نـەناس ئـەم دوو ئەمانەتـەی داوەتـە دەستم کە بیهێنمە خزمەتت، ئەوا منـیش لەسـەر وەسـیەتی خـۆی پێـشکەش بـە ئێـوەی بـەڕێزو خۆشەویـستی دەکـەم، کـاتێ خەلیفـە چـاوی کـەوت بـە قورئـان و ئەنگوسـتیلەکە هەناسـەو ئـاخێکی هەڵکێـشاو سـەری دانەوانـدو فرمێـسکی بـە چـاوەکانیا هاتـەخوارەوە، پاشان بەدەرگەوانەکەی وت: لەگەڵ ئەم پیاوە بـڕۆن و خزمـەتی بکـەن، بـەڵام هـەر کـاتێ خۆم داوام کرد بۆم بهێنن، لە دوای ماوەیەك دەرگەوان هات و وتـی: خەلیفـە داوای هـاتنی تۆ دەکات، بەڵام خەلیفە کەمێك بێتاقەتە زوو هەڵسە لای، منیش چوومە خزمـەت خەلیفـە بە تـەنها دانیـشتبوو، منـیش هاتمـە لای و کـەمێك دوورم لێـی گـرت لەبـەر ئـەدەب، بـەڵام خەلیفە وتی: وەرە پێشەوە منیش چوومە پێشەوە هـەتا لـە هاوشـانی دانیـشتم، خەلیفـە

وتی: تۆ ئەم کوڕەی من دەناسی، وتم: بەڵێ وتی: چ کارێکی دەکرد وتم: کرێکـاری، وتـی: هیچ کاری بۆ تۆ کردووە؟

وتم: بـەڵێ.. وتـی: ئـەی شـەرمت نـەکرد لـەوەی کـە ئـەم کـوڕە نزیکـی خانـەدانی پێغەمبەرەﷺ وتم: ئەی خەلیفە یەکەم داوای لێبووردن لـە خـوا دەکـەم، دووەم لـە پایـەو جێگەی بەرزی ئێوە، چونکە پێشتر نەمزانی و نەمناسی کە ئەم کـوڕە کێیـە؟ هـەتا کـاتی کۆچکردنی، خەلیفە وتی: بە دەستی خۆت شۆریت وتم: بەڵێ، ئـەمجا دەسـتەکانی گـرتم و بە سوکی هێنای بەسەر دڵیا، وتـی: ئـای لـەم ڕێبـوارە دڵـم لـە تـاوی بـوو بـە ئـاو چـاوانم فرمێسك ئەڕێژن وەك هەوری بەهار، بەتاو هەر چەند کەسێ وا لێم دوورە، بەڵام بە خەم لە دڵمایە، بێگومان هـەر بـیری مەرگـە، لـە بـیر دەبـات گـشت سـەرمایە، ئـەمجا خەلیفـە بـە ڕێکەوت بەرەو گۆڕی کوڕەکەی هەتا دڵنیا بێ.

لـە دوای مەڕاسـیمی سـەر گۆڕەکـەی شـەو کـە خـەوتم لـە خـەوما کوڕەکـەم بـینی لـە بەهەشتا ڕوو بەڕووم هات و وتی: یـاڕەبی خـوا پاداشـتت بداتـەوە، چـونکە وەسـیەتەکەی منت ئەنجامدا، وتم: حاڵت چۆن؟

وتی: ئەوەی خوا بە منی داوە، هیچ چاوو گوێ و دڵێك نـەیبینیوەو نەیبیـستووە، و بـە خەیاڵی هیچ کەسێکیشدا نەهاتووە.

ئەم چاکەیە خوای پەروەردگار دەیدات بەو کەسانەی کە شەو نوێژ دەکەن، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾. سورة السجدة : (١٦ — ١٧) .

واتـە: ئەوانـەی کـەوا لـە شـەوا لـەناو جێگـەی گـەرم و نـەرم هەڵدەسـن، و لـە خـوا دەپاڕێنەوەو بەندایەتی بۆ خوا ئەنجام دەدەن، لە ترسـی دەسـەڵاتی خـوای پـەروەردگار،

بە هیوای ڕەحم و لێبوردنی خوا، وە لەو ماڵ و دارایی و سەروەتەی کە داومانە پێیان ئەی بەخشن بە هەژاران، هیچ کەسێ نازانێ خـوا چـی بـۆ ئامـادە کـردووە لـە نـازو نیعمـەت، و خۆشیەکی نەبڕاوەی بۆ ئامادە کردوون، کە مایەی ڕۆشنی و ڕووناك بوونەوەی چاو و دڵە، (عبدالله ی کـوڕی مەسـعود) دەفـەرموێ: ئـەم موژدەیـە لـە تەوڕاتیـشدا بـاس کـراوە، جـا ئەوەیە لەبەر خوا وازهێنان لە دونیا و کەلەپوری دونیا[1].

---

[1] روج الریاحین فی حکایات الصالحین، عفیف الدین الـدین أبـی سـعادات .هـڑه الحکایـه رواهـا المقدسـی فی (التـوابین) ص١٧٠-١٧٣ وفیه (بدرهم ودانق) والدانق سدس الدرهم، تحقیق عبدالقادر الڕناۆوگ، دارالکتب العلمیه / بیروت-لبنـان : ١٩٤ - ١٩٧٤، نقره مرگ، خواجه محمد ئیسلامی پاکستانی .

# سەرگوزەشتەی سی و دوو

# ئەم منداڵە دەناسیت

پێشەوا (بەهلول) یەکێکە لە پیاو چاکان و دەڵێت: ڕۆژێك بەناو شەقامی بەسرەدا دەڕۆیشتم بینیم دوو سێ منداڵ یاری دەکەن، چاوم لێ بوو تەنها منداڵێك ئەگری منیش چوومە لای و لێم پرسی: ئەوە بۆچی دەگریت؟

ئەگەر بۆ ئەو شتانە دەگریت کە یاری پێ دەکەن، من بۆت دەکڕم و یاریان پێ بکە، ئەم منداڵەش بە چاوێکی تووڕەییەوە سەیرێکی کردم و وتی: هەی نەزان تۆ وا دەزانیت من بۆ یاریکردن دەگریم یان بۆ یاری کردن هاتوومەتە دونیاوە.

وتم: ئەی بۆچی هاتوویتە دونیاوە؟

وتی: بۆ بەدەست هێنانی زانیاری و خواپەرستی.

وتم: خوا تەمەنت درێژ بکات ئەم قسەیەت چۆن زانی و بیرت کەوتەوە.

وتی: ئەی خوای گەورە نافەرموێ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ [١]﴾.

واتە: ئایا وا ئەزانن ئێوە بە خۆڕایی و بێ هودە دروست کراون، و ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە.

کاتێ ئەم منداڵەکە ئەم قسەی کرد وتم: کەوابێ تۆ زانایەکی زۆر چاکی هەندێ ئامۆژگاریم بکە.

---

١ـ المؤمنون : ١١٥ .

ئەویش وتی: من دەبینم دونیا ڕۆیشتن و نەمانی هەیە هەر کەسیش لەم دونیایـەدا بـێ، دەبێ هەموو چرکەیەك چاوەڕوانی ڕۆیشتن بێ، کـەوابوو نـە دونیـا بـۆ ژیـانی هەمیشەیی دەبـێ، و نەکەسـیش چاوەڕوانی هەمیـشەیی ژیـان بـێ، مـەرگ و چارەڕەشـی وەکـو دوو ئەسپی تیژڕەو وان، زۆر بە خێرایی بەرەو مرۆڤ دێن و دەیانەوێ تاڵانی بکـەن، تـۆش ئـەی نەزان دەست خەڕۆی دونیا بویت، هەوڵ بدە لەم جیهانـەدا شـتێك لەگـەڵ خـۆت ببـەی بـۆ ژیـانی یـەکجاریت بـەکاربێت، ئـەمجا ڕوی کـردە ئاسمـان و دەسـتی کـرد بـە گریـان، و دەپاڕایەوەو دەیوت: ئەی کەسـێ کـە شـایەنی خودایـەتیت و تـەنگی و شـادی ئێمـەت لـە دەست دایەو لە هەردوو حاڵەتیشدا تۆ جێگەی باوەڕو پشت بەستنی ئێمەیت، هەر کەسـێ بە هیوای تۆ بێ، بێگومان هیوا بڕاوی ناکەیت و بە هیوای خۆی دەگەینیت، کاتێ ئەمانەی وت: بـێ هـۆش کـەوت، منـیش بەپەلـە ڕامکـردو سـەریم کـردە سـەر ڕانم لـە دوای کـەمێك هاتەوە هۆش خۆی.

پـێم وت: تـۆ بۆچـی ئەوەنـدە ئـازاری خـۆت دەدەیـت، هێـشتا تـۆ گونـاه و تـاوان لـە دەفتـەری کردەوەتا نەناسراوەو جارێ مناڵیت.

مناڵەکەش وتی: بڕۆ ئەو لاوە من دایکم دەبینم کاتـێ ئـاگر دەکاتـەوە لـە پـێش هـەموو شتێکدا دارە وردەکان دەکات بە دەستە چیلەو چاوگ و هـۆی سـوتانی دارە گـەورەکان، هەتا دارە وردەکان نەسوتێن دارە گەورەکانیش ئاگر نـاگرن و ناسـوتێن، منـیش دەترسـم وەکو دارە بچوکەکان بە ئاگری دۆزەخ بسوتێم.

وتم: گەورەم دیارە تۆ پسپۆڕیت داوای ئامۆژگاریت لێ دەکەم، دیار بوو ئەو مناڵ بـوو، هێشتا تێکەڵ بە گونـاه نـەبوو بـوو، بـەڵام مـن و بیـسەران و گـوێگرانی بـەم چـەند وتەیـە ئامۆژگاری کردو وتی: من هەرچی تواناو تەمەنم بوو، هـەموویم بـەبێ ئاگـایی و نـەزانی لـە

نەزانیدا لە دەست دا، لە کاتێکدا فریشتەی مردن چاوەڕێم دەکات ئەگەر ئەمڕۆ واز لە دونیا نەهێنم بێگومان بەیانی هەر وازی لێ دەهێنم، ئێستا کە بەرگ و پۆشاکی نەرم و نیان لەبەر دەکەم، بەڵام بەیانی کفن و بەرگی سپی دەپۆشم.

ئێستاکە لە جێگەی نەرما دەخەوم، بەیانی لەناو گۆڕی تەنگا ڕامدەکێشن، ئێستا لاشەم نەرم و شل و ئاوداره، بەیانی گۆشت و پیست و ئێسکەکانم هەموو لەیەك دەترازێت‌و لێك جیا دەبنەوە، من ڕێبوارم و سەفەرێکی دوورو درێژم لە پێشە کە هێشتا توێشوویم بۆ ئامادە نەکردووە.

هەروەها وەستان لەبەردەم کەسێکی وادا کە ئاگادارە بە هەموو کردارو گوفتارم، منیش بە کۆمەڵێ گوناه و تاوانەوە زۆر گرانەو کاری نابەجێیم زۆرەو هەرگیز بۆم قەرەبوو ناکرێتەوە، ئەو کردەوە نابەجێیانەی کە من کردومە، ئەمڕۆ لای خەڵك شاراوەیە، بەیانی لەبەردەم خوای پەروەردگار ئاشکرا دەبێ، هەروەکو ئێستاش لەلای ئەو ئاشکرایە، بێگومان ترس و بیمێك لای خوا هەمە باس ناکرێت، بەڵام بە هیوای لێبوردن و لێخۆشبوونی ئەو زۆر دڵ گوشادو پشت ئەستورم، دەزانم زۆر بەخشندەو میهرەبانە، جگە لە خواش کەسی تر نیە لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزێ، ئەگەر موژدەی بەهەشت و ترساندنی دۆزەخ نەبوایە من وازم لە یاری کردن نەدەهێنا، بەڵام چی بکەم من عەقڵی خۆم لە دەستدا، ئای خۆزگە خوای گەورە لە گوناهەکانم خۆش دەبوو چاوپۆشی لە گوناهەکانم دەکرد، بێگومان من خراپترین کەسم کە پەیمان شکێنیم کرد لەگەڵ خوای خۆم، کاتێ کە ئاگری تۆڵەی تۆ گیانم دەسوتێنێ ئەبێ حاڵم چی بێ، دەزانم هیچ بەردو دارو ئاسنێك بەرگەی ئەو ئاگرە ناگرێ.

ئەی ئەو کەسەی کە تاك و تەنیایت یارمەتی کەسێکی تەنهاو بێ چارەی وەکو من بدە.

(بەهلول) دەڵێت: وتەو گریان و پاڕانەوەی ئەم منداڵە ئەوەندە کاری تێکردم لـە هـۆش خۆم چووم، کاتێ هاتمەوە هۆش خۆم سەیر دەکەم ئەم کوڕە لەوێ نەماوە، پرسـیارم لـە هاوڕێکانی کرد کەوا بزانم ئەو منداڵە کێ بوو؟ منداڵەکان وتیان: دیارە تۆ ئەو منداڵە ناناسیت ئەوە نەوەی پێشەوا (حوسەینە)، بەڕاستی گفتوگۆی ئەم کورە غیرەت هێنەر بوو، منـیش هەر ئاواتم ئـەوەبوو بـزانم میـوەو بـەری چ دارێکـە، بـەڵام دەبوایـە زۆر زوو بمزانیایـە ئـەم میوەیە هی دارێکە کە بنك و ڕەگ و ڕیشەی پێغەمبەری خوایە[١].

---

١ـ نضرة مرگ، خواجە محمد ئیسلامی پاکستانی .

# سەرگوزەشتەی سی و سێ

# مالیکی کوڕی دینار

ڕۆژێکیـان پرسـیاریان لـە مـالیکی کـوڕی دینـار کـرد، هـۆی تەوبەکردنەکـەی بۆچـی دەگەڕێتەوە، ئەویش فەرموی: مـن پـۆلیس بـووم و بـەردەوام ئـالودەی مـەی خواردنـەوە بووم، دوایی کەنیزەیەکی گرانبەهام کڕی و زۆرم خۆش ویست، و کچێکم لەو بوو، ئەو کچە دڵی منی تەواو داگیر کردبوو، کاتێـك گـەورە بـوو، و بەسـەر پێیـان کـەوت زیـاتر خۆشـم ویست، ئەویش منی خۆش ویست.

کە دەمویست مەی بخۆمەوەو لە پێش خـۆمم دادەنـا، ئـەم کـچەم مەیەکـەی لـە پـێش هەڵدەگرتم، منیش دەمویست لێی بستێنمەوە، لە ئەنجامی ئەوە لەسەر کراسەکەم ڕژا، کە ئەو کچەم وەفاتی کرد من زۆر زۆر غەمبار بووم.

لە شەوی هەینی نیوەی شەعبان نوێژی شێوانم نـەکرد، سـەرەڕای ئـەوەی بـە مەسـتی خەوتم، لە خەومدا بینیم ڕۆژی دواییە، لە ناکاو دەنگێکم لە دواوەی خۆم بیست، کە ئـاوڕم دایـەوە بینـیم ئەژدیهایـەکی ڕەش و شـینی زۆر گـەورە لـە دوامـەو دەمـی کردۆتـەوەو بـە خێرایی بۆ لام دێت، منیش زۆر ترسام و ڕامکرد.

لە ڕێگەی هەڵاتنم بەلای پیرێکـی جـل و بـەرگ خـاوێنی بـۆن خۆشـدا تێپـەڕیم، سـڵاوم لێکـردو ئـەویش سـڵاوەکەی وەڵام دامـەوە، و پـێم وت: ئـەی مامـە پـیرە بمپـارێزە لـەو ئەژدیهایە خوا بتپـارێزێ، مامـە پیرەکـەش گریـاو وتـی: مـن بێهێـزم و نـاتوانم بـەرەنگاری ببمەوە، بەڵام خێرا ڕاکە، بەڵکو خوای گەورە یەکێك دێنێتە سەر ڕێگات ڕزگارت بکات لـەم ئەژدیهایە گەورە، منیش ڕامکرد و بەسـەر بەرزاییـەك سـەرکەوتم، کـە گەیـشتمە سـەرەوە چـینەکانی ئـاگرم بـینی، زۆر ترسـام و ئەوەنـدەم نـەمابوو بکەومـە خـوارەوە لـە ترسـی

ئەژدیهاکە، لەناکاو یەکێك هاواری کردو وتـی: بگـەڕێوە تـۆ لـە خـەڵکی ئـەو ئـاگرە نیـت، کەمێك ئارام بووم بە قسەکەی و گەڕامەوە، جارێکی تر ئەژدیهایەکە بە دوام کەوت، منیش بەلای پیرەکـەدا تێپـەڕیم و وتم: ئـەی مامـە پـیرە داوام لێکـردی بمپـارێزی لـەو ئەژدیهایـە گەورەیە بەڵام ڕەتت کردەوە.

مامە پیرەکە گریا و وتی: من بێ هێـزم، بـەڵام بـڕۆ لای ئـەم چیایە لـەوێ ڕاسپاردەی موسڵمانەکانی لێیە، ئەگەر ڕاسپاردەیەکت هەیە بڕۆ لای تا ڕزگارت دەکات.

بینیم چیایەکی خڕی لە زیوەو چەندین کون و کەلەبەرو پەردەو سەر قاپی هەڵواسراوی تیایە، لە هەر کون و کەلەبەرێك دەرگایـەکی لێیـە لـە زێـڕی سـوورو گەوهـەر ڕازاوە، و بـە پەردەیـەکی ئاوریـشم داپۆشـراوە، منـیش بـۆ ئـەم چـیایە ڕامکـرد، و ئەژدیهایەکـەش لـە دوامـەوە بـوو، کـە نزیـك چـیاکە بـووم فریـشتەکان فـەرمویان: پـەردەکان بـەرز بکـەن و دەرگاکان بکەنەوە، لەوانەیە ئەو نا ئومێدە ڕاسپاردەیەکی لێرە هەبێ لەو دوژمنەی ڕزگـار بکات.

بینـیم پـەردەکان بـەرز بوونـەوەو دەرگاکـان کرانـەوە، منـاڵی جـوان وەك مـانگ لـەم دەرگایانە دەهاتنـە دەرەوە، ئەژدیهایەکـەش لـێم نزیـك بویـەوە، و منـیش بـە سەرسـامی مامەوە.

هەندێ لە مناڵەکان هاواریان کرد و وتیان: ئای لە ئێـوە هـەمووتان وەرن، دوژمنەکـەی لێ نزیك بۆوە ئەوانیش پۆل پۆل دەهاتن تا کچەکەی خۆم لە نێوانیاندا بینی.

کە کچەکەم منی بینی دەستی کرد بە گریان و وتی: سوێند بە خوا ئەمە باوکمە، ئەمجا بە خێرایی هاتە لام، و دەستی چەپی خستە سـەر دەسـتی ڕاسـتم، و دەسـتی ڕاسـتی بـۆ ئەژدیهاکە درێژ کرد، هەر کە ئەژدیهاکە ئەمەی بینی یەکسەر ڕایکرد.

پاشان لە کۆشـم دانیـشت و دەسـتی ڕاسـتی لـە ڕیـشم دەخـشاندو پێـی دەوتم: باوکـە گیان! کاتی ئەوە نەهاتوە بگەڕێیتەوە لای خوا؟ ئەمجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە خوای پــەروەردگار دەفــەرموێ: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾. (ســورة الحديد، الآية: (١٦).

واتە: ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ بڕواداران کە دڵیان ملکەچی بێ بۆ ئامۆژگـاری خـوا، گوێبگرن بۆ ئەو قورئانەی کە ناردویەتیە خوارەوە؟ وەکو ئەو کەسـانە (جوولەکـەو گـاور) مەبن، کە لەمەو پێش کتێبی ئاسمانیان پێدرا، ماوەیەکی دوورو درێژیان بەسەردا تێپەری، ئەمجا دڵیان ڕەق بوو، و زۆربەیان یاخی و لە سنوور دەرچوون[١].

منـیش گریـام و وتم: کـچی خـۆم ئێـوەش قورئـان دەزانـن؟ وتـی: باوکـە گیـان! ئێمـە زاناترین لە ئێوە بەم قورئانە.

وتم: کچم ئەو ئەژدیهایە چی بوو کە دەیویست لە ناوم ببات؟

وتی: بابە گیـان! ئەمـە کـردەوە خراپەکانتـە هـەر بـە هێـزت کـردوە، ئـەویش ویـستی بتخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

پێم وت: ئەی ئەو پیرە چی بوو لە ڕێگادا بە لای تێپەڕیم؟

وتی: باوکە گیان! ئەوە کردەوە چاکەکانتە لاوازت کرد تا وای لێهات نەتوانی بەرامبـەر کردەوە خراپەکانت بوستێ.

وتم: کچی خۆم ئێوە چی دەکەن لەو چیایە؟

١ـ پوختەی تەفسیری قورئان، ئامادەکردنی: مەلا محمد مەلا صالح، ل٥٣٩.

وتی: ئێمە منالآنی موسڵمانانین خوای گەورە لێرەدا نیشتەجێی کردوین تا ڕۆژی دوایـی دادیٚ، چاوەڕێتان دەکەین بێنە لامان تا شەفاعەتتان بۆ بکەین.

کاتیٚ هەڵدەستم تەماشا دەکەم خەوە، یەکسەر تەوبەیەکی تەواوم کردو گەڕامەوە ژێـر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودە[١] .

١ـ دموع تائبە، یوسف الحاج أحمد .

# سەرگوزەشتەی سی و چوار

# ئیبنو سیرین

ڕۆژێکیان پێشەوا ئیبنو سیرین دەچێتە یەکێ لە مزگەوتەکان، سەیر دەکات لـە ژووری مزگەوتەکە منداڵێك هێشتا تەمەنی نەگەیشتۆتە (١٠) ساڵ نوێژێکی زۆر بە ملکەچی ئـەنجام دەدات، ئەم منداڵە ئەوەندە ڕوو چووبوو لە نوێژەکەدا تاوەکو دار خورمایـەکی لـێ هـاتبوو کە هیچ جوڵەیەکی نەمابوو، ئیبنو سیرین سوێند دەخوات و دەڵێت: ئەگەر باڵنـدە لەسـەر سەری ڕاوەستابا هیچ جووڵەیەکی نەدەکرد لەبەر ملکەچی نوێژەکەی.

ئیبنو سیرین دەڵێت: کاتێك ئەم منداڵە لە نوێژەکەی بوویەوە، بانگم کردو ئـەویش هـات بۆ لای من، وتم: ئەی منداڵ تۆ کوڕی کێی؟

منداڵەکەش وتی: من هەتیوم و دایك و باوکم نەماوە.

ئیبنو سیرین وتی: ئەی منداڵ ئایا ڕازی دەبیت من ببم بە باوکت و بژێوی ژیانی ڕۆژانەت بۆ دابین بکەم، منداڵەکەش وتی: بەڵێ.. ڕازیم، بەڵام بە پێنج مەرج.

ئیبنو سیرین وتی: ئەم پێنج مەرجەت چیە؟

منداڵەکە وتی:

مەرجی یەکەم: ئەگـەر برسیم بـوو خـواردنم دەدەیتێ، وتم: بـەڵێ خواردنـت دەدەمـێ هەتاکو تێر دەبیت.

مەرجی دووەم: ئەگەر تێنو بووم ئاوم دەدەیتێ، وتم: بـەڵێ ئـاوت دەدەمـێ هـەتا تێـر دەبیت.

مەرجی سێیەم: ئەگەر پۆشاکم نـەبوو پۆشـاکم بـۆ دەکـەیت، وتم: بـەڵێ کامـە پۆشـاك جوانە بۆتی دەکڕم و دەتدەمێ.

مەرجی چوارەم: ئەگەر نەخۆش کەوتم شیفام دەدەیت، وتم: من ناتوانم شـیفات بـدەم، بەڵام دەتوانم دەرمانت بۆ پەیدا بکەم، و چاکبونەوەش لای خوای پەروەردگارە.

مەرجی پێنجەم: ئەگەر مردم زینـدووم دەکەیتـەوە، وتم: ئـەو مەرجـە نـاتوانم، چـونکە مردن و زیندووبوونەوە بەدەست من نیە، بەڵکو بە دەست خوای گەورەیە.

منداڵەکەش وتی: مادەم وایە کە تۆ نەتوانی شیفام بدەیت لە کاتی نەخۆشی، و نەتوانی زیندووم بکەیتەوە کاتێك مردم، مادەم وایە تۆ چیت، دەی وازم لێ بێنە، بۆ کێ؟

بۆ لای ئەو خوایەی ﴿ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾﴾. (سورة الشعراء، الآية: : ٧٨-٨١))

واتە: ئەو منی دروست کردووە پاشان هەر ئەویش ڕێنموونیم دەکات * و هەر ئەو خوایە خۆراکم پێ دەدات و تێراوم دەکات * و کاتێ نەخۆش بکەوم هەر ئەو شیفام دەدات * و خوایەکە من دەمرێنێ و پاشان زیندووم دەکاتەوە[١].

(ئیبنو سیرین)یش دەڵێت: لا إله إلا الله، لەم منداڵە ژیرو ژیتەڵە.

---

١- پوختەی تەفسیری قورئان، ئامادەکردنی: مەلا محمد مەلا صالح، ل٣٧٠.

# سەرگوزەشتەی سی و پێنج

## منالێك خۆڵی لەبەهەشت هێنا بۆ مامۆستاکەی

یەکێك لە قوتابخانەکانی پۆلی دووی سەرەتایی کاتێك مامۆستای عەرەبی وەرەقەی تاقیکردنەوەکانی دەدایەوە قوتابیەکان، یەکێك لە قوتابیەکان لە مامۆستاکەی پرسی و وتی: ببورە مامۆستا دەرەجەکەی من (٨ لە ١٠)ت بۆ داناوم، بەڵام هیچ وەڵامێکم هەڵە نیە، مامۆستاکە وتی: من لەسەر خەت ناخۆشی دوو دەرەجەم لێت شکاندوە.

قوتابیەکە وتی: من دەمەوێ (١٠ لەسەر١٠) م بدەیتێ، کەوتە موناقەشە لەگەڵ مامۆستایەکە، مامۆستاکەش نەیویست لەناو هاورێکانی بیشکێنێتەوە، چونکە قوتابیەکی زۆرباش و زیرەك بوو، مامۆستاکە وتی: ئەگەر هەندێك خۆڵم لە بەهەشت بۆ بێنیت ئەوا نمرەی تەواوت دەدەمێ، قوتابیەکەش گەڕایەوە ماڵ، بۆ بەیانی یەك کیس (عەلاگە) خۆڵی بۆ مامۆستاکەی هێنا.

مامۆستاکە پرسی ئەوە چیە؟

قوتابیەکە وتی: ئەوە خۆڵی بەهەشتە.

مامۆستاکە وتی: چۆن هێنات؟

قوتابیەکە وەڵامی دایەوەو وتی: وام لە دایکم کرد کە بەسەر خۆڵ بکەوێت، و پاشان خڕم کردەوەو لەناو ئەم کیسەم دانا بۆ تۆم هێنا.

ئەی تۆ هەموو جارێك پێت نەدەوتین: (بەهەشت لەژێر پێی دایکانە).

مامۆستاکەش سەرسام بوو بە زیرەکی ئەم قوتابیەو نمرەی تەواوی پێدا [1].

---

١ـ گۆڤاری چرای ڕووناکی، گۆڤارێکی مانگانەی ئاینی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی گشتیە،ژ ٩.

# سەرگوزەشتەی سی و شەش

## ئەبو حەنیفە وەڵامی بێباوەڕان دەداتەوە

لەو سەردەمەی کە پێشەوا (ئەبو حەنیفە) قوتابی بووە، و لەلای مامۆستای بـەناوبانگ (حماد) دەیخوێند، خەوێك دەبینێ لە خەوەکەیدا چاوی بە بـەرازێك دەکـەوێ لـە دارێکـی گەورە هـاڵاوە، و دەیـەوێ دارەکـەی هەڵکـەنێ، لـەو کاتـەدا لقێکـی بچوکی دارەکـە شـۆڕ دەبێتـەوە بـە هـەموو هێـزی لـە بەرازەکـە دەدات، بەرازەکـەش هـاوار دەکـات، و بـۆی دەردەچێ، لە دوای ڕاکردنی بەرازەکە هەر لە خەوەکەیدا چاوی بە ئادەمیزادێـك دەکـەوێ لە ژێر سێبەری ئەو دارە دانیشتووەو یادی خودا دەکات.

لەو کاتەدا پێشەوا (ئەبو حەنیفە) بە خەبەر دێت، و بۆ مانـای خەوەکـەی دەچێتە لای مامۆستای (حماد)، بەڵام کە سەیری مامۆستا دەکـات زۆر بـە مـات و مـەلولی دانیـشتوە، پێش ئەوەی خەوەکەی بۆ بگێڕێتەوە دەپرسـێ: مامۆسـتا گیـان! هـۆی چیە وا بـەمات و مەلولی دانیشتووی؟

لە وەڵامدا وتی: (ئەبوحەنیفـە) چـەند کەسـێکی بـێ بـاوەڕ هاتوونەتـە شـارەکەمان بـە نوێنەری نەتەوەی بێباوەڕەکان، بۆ ئەوەی دانشتنێك لەگـەڵ مامۆسـتایانی بـاوەڕدار پێـك بهێنن بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو بوونەوەرە کە خوایەکی هەیە، چونکە ئەوان باوەڕیـان وایـە کە ئەو بونەوەرە هیچ دروست کەرێکی نیە، و بە سروشت هەبووە، یەکەم جار چوونە لای پادشای ئەو شارەو ئەوانیش منیان بە چاك هەڵبژاردوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسـیارانەی کە ڕێکیان خستووە، و کاتێکمان دیاری کردووە بۆ دانیشتنی ئەو کۆڕە.

منیش هەر چەند بیر دەکەمەوە نازانم چی بکـەم، چـونکە پرسـیار لـە بنـەڕەتی شـتێك دەکەین نە بەچاو دەدیترێ، و نە بە هەستەکانیش هەستی پێ دەکرێ، بۆیـە زۆر دەترسـم لـەو کـۆڕەدا سـەرکەوتوو نـەبم و بڕوادارەکـانیش بڕوایـان تێـك بـچێت، لـە دوای وتـەکانی

مامۆستا (حماد)، پێشەوا (ئەبوحەنیفە) وتی: بە باس کردنی ئەو سەرگوزەشتە مانای خەوەکەشم بۆ ڕوون بویەوە، ئەو بەرازەی کە لە خەومدا چاوم پێی کەوتوە سەرۆکی بێباوەڕەکانە دەیەوێ قەدی ئەو دارە گەورەیە، کە سەرچاوەی زانیاریە هەڵکەنێ، ئەویش ئەتۆی مامۆستا (حماد).

ئەو کەل و لقە بچوکەی لە دارەکەدا شۆڕبۆوە لە بەرازەکەی داوە، و ملی پێ شۆڕکردو بۆڕاندی و هەڵات، ئەوە منم قوتابی تۆ بەبەڵگەی تەواو ملیان پێ شۆڕ دەکەم، و سەر بۆ ئیسلام دانەوێنن، مامۆستا گیان! تۆ هیچ خەفەت مەخۆ، ڕێگە بە من بدە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان، بێگومان ئەگەر سەرکەوتم ئەوا شتێکی زۆر پیرۆزە کە قوتابیەکی بچوکی تۆ توانای وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی هەیە؟

ئەگەر سەرنەکەوتم ئەوا تۆ هیچ دڵتەنگ مەبە، چونکە من قوتابیەکی بچوکی تۆم، بەڵام کە تۆ وەڵامت بدابانایەوە دیارە زۆر بە ئاسانی سەردەکەوتی مامۆستا (حماد)، بەو وتانە زۆر دڵخۆش بوو، و وتی: زۆر باشە بە هیوای خوای گەورە، لە دوای ئەوەی لە شوێنی دیاری کراو کۆبونەوە، کۆمەڵێکی زۆر چاوەڕوانی مامۆستا (حماد) بوون، لەو کاتەدا قوتابی زیرەك و لە خواترس ڕۆشتە ناو کۆڕەکەوە بە دانیشتوانی وت: بەڕێزان لەبەر سادەیی پرسیارەکان مامۆستا (حماد) نەیتوانی ئامادەی کۆڕەکە ببێ، بۆیە بچوکترین قوتابی بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانتان ئامادە بووە کە منم، خوا یار بێت بە تەواوی وەڵامی پرسیارەکانتان دەست دەکەوێ، ئێستاش چ پرسیارێکتان هەیە بفەرمون؟

پرسیاری یەکەم:

بێباوەڕەکان وتیان: خواکەتان لە چ ساڵێك لە دایك بووە؟

پێشەوا (ئەبو حەنیفە) فەرموی: خواکەمان نە دایکی هەیەو نەباوك، لە هیچ کەسێك نەبوە ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾﴾. (سورة الإخلاص : الآية: ( ٣-٤ ).

پرسیاری دووەم:

بێباوەڕەکان وتیان: لەساڵی چەند خواکەتان لە دایك بووە؟

پێشەوا (ئەبو حەنیفە) فەرمووی: خوداکـەمان سـەرەتاو کۆتـایی نیـە، و بـەردەوام هـەر بووەو هەر دەبێ.

پرسیاری سێیەم:

بێباوەڕەکان وتیان: دەمانەوێ بە بەڵگەی زانسی و ڕەوان بۆمـان دەربخـەیت کـە خـوا هەیە، بەڵام بەڵگەکەت قورئانی نەبێت؟

پێشەوا (ئەبوحەنیفە) فەرمووی: ئایا لە پێش ژمارە چوار چ ژمارەیەك هەیە؟

وتیان: ژمارە سێ.

ئەی لە پێش ژمارە سێ؟

وتیان: ژمارە دوو هەیە.

ئەی لە پێش ژمارە دوو؟

وتیان: ژمارە یەك.

ئەی لە پێش ژمارە یەك؟

وتیان: هیچ ژمارەیەك نیە.

ئەمجا پێی وتن: باشە ئەگەر لە پێش ژمارە یەك هیچ نەبێت، چۆن دەگونجێت لە پێش یەکی و ڕاسـتی و دوور لـە خـەیاڵات کـە خودایـەکی گەورەیـە شـتێك هـەبێت، بۆیـە خـودا سەرەتای هەبووەو سەرەتای بونی نیە؟

پرسیاری چوارەم:

خوداکەتان ڕووی لە کوێیە؟

فەرمووی: ئەگـەر چرایەك هەڵبگرسـێنن لـە جێگایـەکی تاریـك، ڕووناکیەکـەی بـۆ کـوێ دەڕوات؟

وتیان: ڕوناکیەکەی بە هەموو لایەك بڵاودەبێتەوە.

فـەرمووی: ئـەی بۆچـی دەبـێ گـەورەیی و ڕونـاکی خـوای گـەورە تـەنها بـە لایەکـدا بڵاوبێتەوە؟

پرسیاری پێنجەم:

ئێستا شتێکمان لە خودی خوداکەت پـێ بناسـێنە ئایا ڕەقـە وەکـو ئاسـن؟ یـان شـلە وەکو ئاو؟ یان غازیە وەکو دوکەڵ و هەڵم؟

فەرموی: ئایا ئێوە هیچ جارێك بە ڕێکەوت دانەنیشتون لەلای نەخۆشێك لە کـاتی گیـان دەرچوون؟

وتیان: بەڵێ دانیشتووین.

فەرموی: باشە پێش مردن قسەی لەگەڵدا کردن و دەجوڵایەوە، بەڵام لە دوای مردن لە جوڵەو قسەکردن کەوت لەبەرچی؟

وتیان: لەبەر ئەوەی گیانی تیا نەما.

فەرموی: باشە ئێوە لەلای بوون کاتێ کە گیانی دەرچوو؟

وتیان: بەڵێ لەلای بووین.

فەرموی: دە ئێوەش خودی ئەو گیانەم بۆ باس بکەن؟

وتیان: بێگومان لەو بارەیەوە هیچی لێ نازانین، فەرموی: ئێـوە نـازانن گیـان چـیە کـە دروست کراوێکی خوایە، بەڵام داوای ناسینی خودی خودام لێ دەکەن؟

پرسیاری شەشەم:

خوایەکەت ئێستا لە کوێیە؟

فەرموی: ئەگەر بەرداخێك شیر بدۆشی و بیهێنی ماددەیەکی چەوری تێدایە؟

وتیان: بەڵێ.

فەرموی: باشە چەوریەکەی لە کوێی شیرەکە دایە؟

وتیان: شوێنی تایبەتی نیەو لە هەموو گەردیلەی شیرەکەدا بڵاوبۆتەوە.

فەرموی: دروستکراوێکی ئەو خودایە کە چەوری شـیرەکەیە هـیچ جێگەیـەکی تایبـەتی نەبێت، ئێوە دەتانەوێ خودی خوداتان پێ نیشان بدەم و شـوێنی بـۆ دابنـێم، بـە ڕاسـتی شتێکی سەیرە؟

پرسیاری حەوتەم:

ئەگەر ئێوە دەڵێن: هەموو شتێك دیاری کراوە لە پێـشی ئـەو بوونـەوەرە، ئـەی ئیـشی خوداکەت چیە؟

فـەرموی: ئـەو کردەوانـەی کـە لەسـەرەتاوە خـودا دایـنـاوە بـۆ ئادەمیزادەکـان نـەی چەسپاندوە، بفەرمویٚ: حەتمەن هەر دەبیٚ بیکات، و خوا هـیچ دەسـەڵاتی تیـا نیـە؟ هـەر کاتێك ئادەمیزاد ئیشەکەی کرد ئـەو کاتـە لەسـەری دەنوسـریٚ، و بـەو هۆیـەوە هـەوڵ و کۆششی ئادەمیزاد کە خوای گەورە هەندێکیان بـەرز دەکاتـەوەو هەنـدێکیش سـەر شـۆڕو نزمیان دەکات.

پرسیاری هەشتەم:

چوونە بەهەشت سەرەتای هەیە، بەڵام کۆتایی چۆن نیە؟

فەرمووی: ژمارەی حیسابی سەرەتاییان هەیە لـە یەکـەوە دەسـت پـیٚ دەکـات، بـەڵام بڕانەوەیان نیە.

پرسیاری نۆیەم:

ئەی چۆن دەڵێن: لە بەهەشتدا دەخۆین و دەخۆینەوە، بەڵام پاشەڕۆی نیە؟

فەرموی: ئێمەو هەموو گیانلەبەرێك لەناو منداڵدانی دایکیدا (٩) مـانگ دەمێنینـەوە بـە گوێرەی پێویست خواردن و خواردنەوە دەخۆین، و هیچ پاشەڕۆیەکی هەیە؟

پرسیاری دەیەم:

ئێوە دەڵێن: میوەو خۆراکی بەهەشت هەردەی خۆیت و کۆتایی نایەت؟

فەرموی: خوای پەروەردگار زانست و زانیاری پیٚ بەخشیوین کۆتایی نایەت.

پرسیاری یانزەهەم و دوانزەهەم و سیانزەهەم:

دەڵێن: خودا هەیە پیشانمان بدەن؟ و دەڵێن: پەری لە ئاگر دروست کراوە بە ئـاگریش سزا دەدریٚ، چۆن ئاگر بە ئاگر سزا دەدریٚ؟ و دەڵێن: هەموو شتێك دیاری کراوە بە قەزاو قەدەر لەسەر مرۆڤ، ئەی بۆچی لەسەر کردەوەکانی ئازار دەدریٚ؟

فەرموی: بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە پێویستیمان بە شتێکی دیاری کراو هەیـە بـۆ تێگەیاندنتان، ئەوانیش بە جارێك وتیان: چ شتێکی پێویستە؟

پێشەوا (ئەبو حەنیفە) مشتێك خۆڵی هەڵگرت و بە دەموچاوی بێباوەڕانیدا، بە تایبەتی سەرۆکی بێباوەڕان، دەنگی ناڕەزایی بەرز بۆوە، وەزیر کە ئامادەی کۆڕەکە بوو هاتە نـاو باسەکەو زۆر بە ناڕەزایی وتی: بۆچی شتی وات ئەنجامدا؟

فەرموی: ئەوە وەڵامی پرسیارەکانیان بوو: وتیان: چۆن ئەوە وەڵامە؟

فەرموی: بەڵێ وەڵام بوو، ئایا هیچ ئازاریان پێگەیشت.

سەرۆکی بێ باوەڕەکان وتی: بەڵێ ئازارمان زۆر پێگەیشت.

پێشەوا (ئەبوحەنیفە) فەرموی: کوا ئازارەکە لەکوێیە پیشانم بدە؟

سەرۆکی بێباوەڕەکان وتی: ئازارەکە بە برینەکەوەیە، بەڵام ناتوانم پیشانت بدەم، پێشەوا (ئەبوحەنیفە) فەرموی: کە تۆ نەتوانی ئازارێکی بچوکی گیانتم پێ نیشان بدەی چۆن داوای پیشاندانی خوای پەروەردگارم لێ دەکەیت؟

هەروەها ئێوە وتتان: چۆن پەری لە ئاگر دروست کراوە بە ئاگر سزا دەدرێ؟ ئەی چۆن ئێوە لە خاك دروست کراون (واتە: ئادەمیزاد توخمێکی تەواوی لە خاکە، چۆن بەو خاکە ئازارتان پێگەیشت، هەروەها ئێوە دەڵێن: هەموو شتێکی دیاری کراو قەزاو قەدرە بۆچی لەسەری سزا دەدرێی، ئەی بۆچی ئێوە هاوارتان کردو نارەزاییتان دەربڕی و داوای تۆڵە لەمن دەکەن؟ خۆ ئەوەش قەزاو قەدەر بوو هەردەبا بمکردبایە.

کاتێ سەرۆکەکە زیرەکی ئەم منداڵە بچوکەی بینی یەکسەر خۆی و زۆرێك لە هاوەڵانی باوەڕیان هێناو هاتنە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلام و، هەموو بەیەك دەنگ وتیان: ((أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله))[1].

---

١ـ أنيس المؤمنين، صفوك سعدالله المختار .

# سەرگوزەشتەی سی و حەوت

## ڕۆژی جەژن

لە قودس جەژن و شـادیبوو، جـەژنی پەرسـتن و کڕنـوش بـردن بـۆ خـوا بـوو بـە پێـی شەریعەتی پێغەمبەر موسی (سەلامی خوای لێ بێ)...

مەریەم و عیسای کوری کە تەمەنی (١٢) ساڵان بوو بەشداریان لەو کۆڕو جەژنەدا کرد.

ڕۆژی جەژن تەواو بوو، بڕیاری گەڕانەوەیاندا بۆ (ناصـرە، کـە (٥٠) میـل لـە قودسـەوە دوور بوو، بەڵام پێغەمبەر (عیسی) دیار نەماو بزر بوو، مەریەم لەگەڵ یوسفی ئامۆزای زۆر گەڕان بە شوێن کوڕەکەیدا، بەڵام دیـار نـەبوو، کـاتێ بـە تـەواوی گـەڕان بینیـان وا لـەناو کۆمەڵێك ئەحبارو پیاوانی ئاینی کەوتۆتە گفتوگۆو دیار بوو هـەموویان سەرسـام بـوون بـە قسەکانی، پرسیاری لێدەکردن و ئەوانیش پرسـیاریان لێـدەکرد، چاوەڕێی ئـەوە نـەبوون منالێکی تەمەن(١٣) ساڵی ئاوا لە تەورات و نهێنیەکانی شارەزا بێت.

ئەمجا مەریەم گەشایەوەو پێی وت: کوڕم بۆ وات لێکردین و لەبەر چاومان نەمایت ئێمە بڕیارمان داوە بگەڕێینەوە بۆ (ناصرە).

ئەویش بەو پەڕی ڕێزەوە پێشوازی لە وتەکانی دایکی کردو لەگەڵیان گەڕایەوە.

ڕۆژ بـەڕۆژ مەریـەم جگـەر گۆشـەو نـوری چـاوی دەبـینی گـەورە دەبێـت، ئـەویش لـە بەندایەتی و خواپەرستیدا لە وێنەی دایکی بوو.

ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر شارەزای تەورات دەبوو، سوور بوو لەسـەر ئاشـکراکردنی ڕاسـتیەکانی ناو تەوڕات، هەرگیز سڵی لە کەس نەدەکرد، و لە لۆمـەی لۆمـەکاران نەدەترسـا، زۆر جـار لەگەڵ زاناکانی تەوڕاتدا گفتوگۆی زۆر گەرمی دەکردو قەناعەت و بۆچوونەکانی بـۆ ڕاسـت دەکردنـەوە، و داوای لێـدەکردن بگەڕێنـەوە سـەر بـیرو بـاوەڕو ڕەوشـتی ڕاسـتەقینەی تەورات، و واز لە بیرو بۆچونەکانی خۆیان بهێنن کە بەناوی تەوڕات بە خـەڵکیان دەوت بـۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندی خۆیان.

خەڵکی بە وتەکانی پێغەمبەر عیسا دڵشاد بوون، لە دەوری کۆدەبوونـەوە، گوێیـان لـە وتەو ئامۆژگاریەکانی دەگرت.

لە جەژنی (فەیصح)دا هێرشێکی زۆری کردە سەر سەرانی جولەکە، فێـڵ و درۆکانیـانی ئاشکرا دەکرد — تواناو دەسەلاتی هێنانە لەرزە، ئاشکرای کرد کە ئەوەی ئەوان ئـەنجامی دەدەن جگە لە پارە خواردنی هەژاران و خەڵك خەڵەتاندن شتێکی تر نیە، و نە لە دوور نە لە نزیك پەیوەندی بە پەیامی پێغەمبەرانەوە نیە.

خوێنەری بەڕێز: ئەمە کورتەیەك بوو لەبارەی پێغەمبەر عیسی (سەلامی خـوای لێـبێ) کە لەم تەمەنە بچوکەدا خەڵکانی ئەو سەردەمەی چۆن سەرسام کردووە[1].

---

١ـ حياة النبي عيسى عليه السلام.

# سەرگوزەشتەی سی و هەشت

# لەسەردەمی خەلیفە عومەردا

خەلیفە عومەر(رضي الله عنه) زۆر ڕێزی عەبدوڵای کوڕی عەباسی دەگرت، و ماوەی دەدا لەگەڵ ڕیش سپیانی بەدردا ئامادەی کۆڕی خەلیفە ببێت، بە ڕاددەیەك کە هی وایان هەبوو لەو ڕیش سپیانە ئەم کردارەی عومەری پێ ناخۆش بوو، چونکە عەبدوڵای کوڕی عەباس لەوکاتەدا مناڵ بوو.

سەعیدی کوڕی جوبەیر(رضي الله عنه) لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: پێشەوا عومەر ماوەی دەدا لەگەڵ ڕیش سپیانی بەدردا بچمە ژوورەوە، و هی واشیان هەبوو کە گرتبوویە دڵ و دەیوت: بۆچی ماوە دەدەی ئەم منداڵە لەگەڵمان بێتە ژوورەوە، کە ئێمەش کوڕی وەکو ئەومان هەیە؟

دەڵێت: وابزانم هەر بۆ ئەوە بانگی کردم تا تێیان بگەیەنێ.

فەرموی: دەربارەی فەرمایشتی خوای باڵادەست چی دەڵێن کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴾.

هەندێك وتیان: خوای گەورە فەرمانمان بەسەردا دەدا کاتێك کە سەری خستین سوپاسی بکەین و داوای چاوپۆشی لێ بکەین، هەندێکیشیان بێدەنگ بوون و هیچیان نەوت.

بە منیشی فەرمو: ئیبنو عەباس تۆش وەها دەڵێیت؟

وتم: نەخێر.

فەرموی: ئەی چی دەڵێی؟

وتم: ئەوە هاتنی ئەجەلی پێغەمبەری خوایە(صلى الله عليه وسلم) کە خوای گەورە پییشانی دا، کە فەرموی: ئەگەر سەرکەوتن و فەتحی خوات پێشکەش کرا، ئەوە نیشانەی ئەجەلتە، دە

تۆش سوپاس کردنی خوای پاك و بێ گەرد دەربڕە، و داوای لێخۆش بوونیشی لێ بکە، چونکە خوای گەورە لێبوردەیە.

پێشەوا عومەر فەرموی: منیش هەر ئەوەی لێدەزانم کە تۆ دەیڵێت [1].

بۆیە عەبدواللە یەکێك بوو لەو چەند منداڵەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەیعەتی لێ وەرگرتوون.

---

١ـ رواه البخاري: (٦/٩٤ ـ ٥/٩٤) .

# سەرگوزەشتەی سی و نۆ

# تەڵاقی نەکەوتووە

پێشەوا شافعی دەفەرموێ: لەو کاتەی کە منداڵ بووم، خەوێکم بینی بـە پیاوێـك پـێش نوێژی بۆ خەڵك دەکا، منیش لێی نزیك بوومەوەو پێم وت: فێرم بکە.

ئەویش تەرازوویەکی لەناو گیرفانی دەرهێناو لەناو دەستمی دانـاو پێـی وتم: ئەمـە بـۆ تۆیە.

ئەم خەوەم بۆ یەکێك لە زانایان گێڕایەوە، کە گوێی لەمە بوو وتی: تۆ گەورە دەبیت و دەبیت بە پێشەوای خەڵکی و لەسەر سوننەتی پێغەمبەرﷺ دەڕۆی.

جارێکیان یەکێك هاتـە لای پێـشەوا مالیـك و پێـی وت: مـن بولبـولێکم فرۆشـتووە بـەم کابرایەو پێم وتوە: ئەمە قەت بێدەنگ نابێ و هەر دەنگی خۆشی لێوە دێت، ئەگەر وانەبێ ئەوە تەڵاقم کەوتوە، ئەمجا دوای ڕۆژێك بولبولەکەی بۆ هێنامەوەو وتی: ئەمە دەم نا دەم بێ دەنگ دەبێ، ئایا تەڵاقم کـەوتووە؟ پێـشەوا مالیـك فـەرموی: بـەڵێ تـەڵاقت کـەوتوە، پێشەوا شافعیش لەوکاتەدا ئامادەبوو لای پێشەوا مالیك، چونکە دەرسی لەلای دەخوێندو فەرموی: قوربان، لەلای من تەڵاقی نەکەوتووە، پێـشەوا مالیـك فـەرموی: چـۆن؟ بەڵگـەت چیە؟

پێـشەوا شـافعی فـەرموی: لەبـەر فـەرموودەی فاتیمـەی کـچی قـەیس کـە دوو کـەس داخوازیان کردبوو، یەکێکیان ئەبو جەهم بوو، کە پێغەمبەرﷺ دەربارەی ئەو فەرموی: (لا یضع عصاه عن عاتقه) واتە: ئەبو جەهم قەت داری سەفەر لەسـەر شـانی خـۆی ناهێنێتـە خوارەوە، واتە: بەردەوام لە سەفەردایە، زانراویشە کە ئەبو جەهم دەخەوت و دەمایـەوەو دادەنیشت، کەواتە مەبەستی ئەم پیاوە کە زۆربەی کاتەکان دەخوێنێ و دەنگی لێوە دێ، وا نیە؟ پیاوەکە وتی: بەڵێ من مەبەستم وابوو.

پێشەوا مالیك فەرموی: ڕاست دەکەیت تەڵاقی نەکەوتووە[١].

---

١ــ حیاه الآمام شافعی.

# سەرگوزەشتەی چل

## عومەیری کوڕی سەعد

خوای پەروەردگار ویستی وابوو عومەیری کوڕی سەعد(﵁) هەر بە منـاڵی بـاوکی بـێ دەرامەت و بێ سامان بەجێی بهێڵێ، واشی ڕێك خست کە دایکی شوو بە یـەکێ لـە پیـاوە دەوڵەمەندەکانی تیرەی ئەوس لە شاری (یثرب) بکات کە ناوی (جولاسـی کـوڕی سـوەید) بوو، (جولاسی کوڕی سوەید) لـە پـاڵ دەوڵەمەندیەکەیـدا پیـاوێکی دڵ فـرەوان و خـاوەن بەزەیی، و چاودێرێکی دڵسۆز بوو بۆ (عومـەیر)، بەمـە (عومـەیر) هـەتیویی و بێبـاوکی لـە بیرچـویەوە، هـەروەك جـۆلاس عومـەیری بـە کـوڕێکی زۆر خۆشەویـستی خـۆی دەزانـی، عومەیریش بەو شێوەیە جولاسی زۆر خۆش دەویست.

ڕۆژان تێدەپەڕین بەرە بەرە عومەیر گەورە بوو، هەر چـەندە عومـەیر گـەورەتر دەبـوو جولاس زیاتر خۆشی دەویست و لە دڵیدا جێگای دەبۆوە.

چونکە عومەیر لە هەموو هەڵسوکەوتێکیدا دەردەکەوت کە خاوەن ژیـری و زیرەکیـەکی بێ ئەندازەیە، ئیتر با دەست پاکی و ڕاستگۆییەکەی لەولاوە بوەستێ.

ئاینی ئیسلام دەستی بەبڵاوبوونەوە کرد، کۆمەڵی موسڵمان بنکەی پتـەوی لـە مەدینـە بۆ خۆی دامەزراند، تا بەسەربەستی لە ژێر سایەی قورئاندا خوا پەرستی بکـات، و ڕێبـازی قورئان بە مرۆڤایەتی بگەیەنێ.

عومەیری کوڕی سەعد(﵁)یش لە تەمەنی (١٠) ساڵیدا موسڵمان بوو، بوو بەئەندامێکی تـازە پێگەیـشتووی کۆمەڵگـەی ئیـسلام، هێـشتا هـیچ جـۆرە بیروبڕوایـەك لـەناو دڵـە ناسکەکەیدا جێی خۆی نەکردبۆوەو بە سپێتی مابۆوە، بیروبڕوای ئیـسلامی گەیـشتێ و بـە جوانی و ڕێك و پێکی تیایدا جێگیر بوو، بەمە ڕۆژ بە ڕۆژ بڕوای خـوایی لـە ناویـدا ڕیـشەی دائەکوتا.

هەر بە منالّی لە هیچ نوێژێك دوا نەدەکەوت، و دەبوایـە لـە پـشت پێغەمبـەرەوە(ﷺ) نوێژی کردبایە، دایکیشی کە چاوی بە کوڕە تازە پێگەیشتووەکەی دەکەوت وا بەو منالّیە خۆشەویستی ئیسلام و خۆشەویستی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) چۆتە دڵیەوە، و بۆ نوێـژ کـردن لەگەڵ جولاسی هاوسەریدا هاتوچۆی مزگەوتی دەکرد.

لەو کاتەدا دلّ گەرمیەك گەنجەکانی مەدینەی گرتبۆوە، بە هیچ شێوەیەك بەرژەوەنـدی خۆیان بەبیر نەدەهات، تـەنها خـەریکی خواپەرسـتی و لەبـەرکردنی قورئـانی پـیرۆز بـون، هەموو ئەندامێکیان کردەوەی سـود بـەخش و ڕەوشـتی بـەرز بـوو، عومـەیریش بـەردەوام خواپەرستی دەکرد هەر چەندە بە تەمەنیش منالّ بوو.

پێغەمبەر(ﷺ) لە سالّی (٩)یەمی کۆچی بڕیاریدا هێرش بۆ سەر (تـەبوك)[1] ببـات، و بـە گژ ڕۆمەکاندا بچێت، و فەرمانیدا هەر موسڵمانێك کە دەستی چەك دەگرێت با ئامادەی ئەو جەنگە ناهەموارە بێت.

لـە هێرشـەکانی تـردا پێغەمبـەر(ﷺ) ڕاسـتەوخۆ نیـازی خـۆی بـۆ هـەموو لەشـکر دەرنـەدەبڕی، چـونکە شـاری مەدینـە پایتـەخت و بنکـەی ئیـسلام بـوو، لەولاشـەوە مونافیقەکان هەموو هەواڵێکیان ئەگەیاندە دوژمنانی ئیسلام، لەبـەر ئـەوە جگـە لـە چـەند کەسێکی کەم کەس ئاگادار نەدەکرا، بەلاّم لـە جـەنگی تەبوکدا راسـتەوخۆ لای خـەڵکەکـە ئاشکرای کرد، لەبەر ئەوەی هەموو کەسێ ئاگاداربێ و خۆی ئامادە بکات بۆی.

جەنگی (تەبوك): بریتی بوو لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، شوێنەکەش زۆر دوور بوو، نارەحەتی و تەنگاوی لەو پەڕی پلەدا بوو.

ئـەم ڕووداوە لـە وەرزی هاوینـدا بـوو، گـەرما تـینی سـەندبوو، و بـەرو بـوم تـازە پێگەیشتبوو، سێبەر خۆش بوو، و لەبەر گەرما خەڵکی تـینی لا نـەما بـوو، لەگـەڵ هـەموو ئەمانەدا موسڵمانەکان بە دەم بانگەوازی پێغەمبەرەکەیانـەوە هـاتن، و دەسـتیان بـە خـۆ

[1] ـ شوێنێك بوو لەسەر سنوری شام بەدەست ڕۆمەکانەوە بوو، ئێستاش شارێکە سەر بە وڵاتی سعودیە.

ئامادەکردن کرد بوو، بەڵام هەندێ لەو مرۆڤانەی کە تەنها بـە دەم موسـڵمان بـوو بـوون و دڵیان بە تیشکی باوەڕ ڕۆشن نەبوبۆوە، دەستیان دایە پڕوپاگەندە دژ بە پێغەمبەر(ﷺ)و لەشکری ئیسلام، تا دڵی خـەڵکی ساردبکەنەوەو گومـان و دوو دڵییـان بڵاودەکـردەوە تـا کۆمەڵی تەمەڵی دانیشتوو زۆر ببێـت و دووڕوویـی ئـەوان دەرنەکـەوێ، وتـەی ئـاوا بەسـەر دەمیانــدا دەهــات کــە بــەجارێ لــە ڕێــزی موســڵمانان دەری دەکردنــە دەرەوە، پڕوپاگەندەکانیان وەها کاریگەر بوو کـەوا زۆر لـە موسـڵمانە دڵسۆزەکانیش دڵیـان سارد بووبۆوە.

چەند ڕۆژێك بەر لەوەی کە لەشکری موسڵمانەکان لە مەدینەوە بەرەو تـەبوك دەرچـێ، عومەیری کوڕی سـەعد(ﷺ) کـە هێـشتا منـاڵ بـوو، دوای بـەجێهێنانی نوێـژ لـە مزگـەوت گەڕایەوەماڵەوە، بەڵام بە دڵێکی شاددمانەوە بە دەرونێکی بەرزەوە، چونکە لـە مزگـەوت بە چاوو گوێی خۆی لێ بڕان و چاونەترسی و سەرو ماڵ نەویستی موسڵمانەکانی دی.

چاوی لێ بوو ئافرەتە ئەنصارەکان و موهاجیرەکان دەهاتنە خزمەت پێغەمبـەر(ﷺ) و هەرچی خشڵ و زێڕیان هەبوو دایان ئـەماڵی و ئـەیان خـستە بـەردەمی، تـا بـە نرخەکـەی لەشکری جیهادی ئیسلامی بەڕێ بکات و بینێرێتە مەیدانی ستەمکارانەوە، عومەیری کوڕی سەعد(ﷺ) چاوی لێ بوو کە عوثمانی کوری عـەففان(ﷺ) تورەکەیـەکی هێنـا کـە (١٠٠٠) دینار زێڕی تیابوو و پێشکەشی پێغەمبەری خوای کرد.

هەروەها بە بەرچاوی ئەوەوە عەبدوڕڕەحمانی کوری عەوف(ﷺ) (٢٠٠) ئۆقیـەی زێـڕی بەسەر شانیداو هێنایە بەردەستی پێغەمبەر(ﷺ)، هەتا چاوی لێ بوو یـەکێ لـە موسـڵمانە هەژارەکان نوێنەکانی خۆی هێنا بۆ فرۆشتن، هـەتا بـە نرخەکـەی شمـشێرێك بکرێـت و لـە ڕێی خوا بجەنگێ.

عومەیری کـوڕی سـەعد(ﷺ) ئەمانـەو زۆر شـتی تـری ڕاسـتەوخۆ دی، بـڕوای کـرد کـە ڕاستە کۆمەڵگەی ئیسلامی بەسەرو ماڵەوە لێ ئەبڕێ و هەموو گران بەهایەکی لا بێ نرخەو

بەوپـەڕی سـنگ فراوانیـەوە لـە ڕێگـەی خـودا بـەختی دەکـات، چـونکە ئـاوات و ئامـانجی کۆمەڵگەی ئیسلامی ڕاستەقینەیە، و دەیەوێت پاداشتی خوای پەروەردگار بەجێ بگەیەنێ و لێیان خۆش بێت.

عومەیری کوڕی سەعد(ﷺ) بیری لە هەڵوێستی بەرزو پـیرۆزی موسـڵمانان دەکـردەوە، کەچی سەری لـە جولاسـی زڕ بـاوکی سـوڕئەما کـەوا بـە هـیچ شـێوەیەك نـاجوڵێ و خـۆی ئامادەی مەیدانی جیهاد ناکات، و لەگەڵ ئەوەشدا کە دەست ڕۆیشتوو بوو.

کاتێك لە مزگەوت گەڕایەوە دەستی بـە گێڕانـەوەی دەنـگ و باسـی مزگـەوت کـرد، تـا بـەڵکو غیرەتــی جوڵاسـیش بجـوڵێ و خـۆی کۆبکاتــەوە، و هەرچـی لـە توانایـدا بێـت ببەخشێت، چونکە کۆمەڵێك موسڵمانی هەژار دەهاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) داوایان لـێ کـرد کۆمـەکیان بکـات بـۆ ئـەوەی بتـوانن ئـەوانیش جـەنگی ڕۆمـەکان بکـەن، بـەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هیچی لانەما بوو تا ئـەوانیش بخاتـە ڕێ، بۆیـە بـە گریانـەوە گەڕانـەوە لـە داخی ئەوەی کە هیچیان شك نەئەبرد تا بەشداری جیهاد بکەن[١].

بەڵام جولاس وتی: ئەی عومەیر ئەگەر محمد(ﷺ) ڕاست بکات و پێغەمبەری خوا بێت، ئێمە لە کەر خراپترین.

عومـەیری کـوڕی سـەعد(ﷺ) تێگەیـشت، ئـەم وتەیـە بـۆ جـولاس بەسـیەتی، چـونکە جۆلاس بەو پەڕی خۆشەویستیەوە ڕێزی لە عومەیر دەگرت، هەموو شاری مەدینەش لەوە ئاگادار بـوون کـە جـۆلاس پیاوچـاکێکی دڵسۆزە، ئەگـەر عومـەیر ئـەم هەڵەیـەی جـولاس بگەیەنێ و ئاشکرا ببێ ئەوا دانیشتوانی مەدینە بە سپڵەو بەدنمـەکی لـە قەڵـەمی دەدەن، لەو لاشەوە عومەیری کوڕی سەعد(ﷺ) خۆی بە موسڵمان دەزانـێ و یەکێکـە لـەو گەنجـە خـوێن گەرمانـەی کـە کۆمـەڵگای موسـڵمانیان پـێ ڕازاوەتـەوە، بـەڵام ئەگـەر ئـەم وتەیـە

١ـ موسڵمانە دەست کورتەکان حەوت کەس بوون : (١) سالیمی کوڕی عومەیر (٢) عولبەی کوڕی زەید (٣) عەمری کوڕی غونمە (٤) سایمی کوری هەرەمی کوڕی عەمر (٥) ئەبولەیلای مازنبی (٦) سەلمەی کوڕی صـەفەر (٧) عیرباضـي کوڕی ساریە .

نەگەیەنێت ئەوا ناپاکی کردووە لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیﷺ، منالێکی تەمەن (١٠ - ١٢)ساڵ ئەبێ بەتەنیا چۆن بیر لەم گیروگرفتە بکاتەوە.

عومەیری کوڕی سەعد(ﷺ) پاش ماوەیەکی کەم وەڵامی جۆلاسی دایەوەو وتی: بەخوا، جولاس! لەسەر ئەم زەویەدا جگە لە موحەمەدی کوڕی عەبدوالله کەسێکی تر نەبووە لە تۆم خۆشتر بوێت، بەڵکو تۆ خۆشەویسترین و دڵسۆزترین و بەخشش دارترین کەسی بۆ من، ئێستە تۆ قسەیەکت کرد ئەگەر باسی دەکەم تۆی پێی ئەشکێیت، و ئەگەر باسیشی نەکەم ئەوان خیانەتم لەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کردوە، جا تۆ بیرێك لەخۆت بکەرەوە.

عومەیری کوڕی سەعد(ﷺ) بەرەو مزگەوت کەوتە ڕێ، لەوێ ئەوەی لە جولاسی کوڕی سوەیدی بیستبوو بە پێغەمبەری(ﷺ) ڕاگەیاند.

پێغەمبەریش(ﷺ) عومەیری کوڕی سەعدی(ﷺ) لای خۆی هێشتەوەو یەکێك لە هاوەڵانی بە دوای جولاسدا نارد، ئەوەندەی پێ نەچوو جولاس هات و سەلامی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامی سەلامەکەی دایەوەو فەرموی: ئەی جۆلاس ئەو قسەیە چیە کە (عومەیری کوڕی سەعد لێتی دەگێڕێتەوە؟ پاشان وتەکانی جولاسی فەرموو.

جولاس وتی: درۆم بۆ هەڵئەبەستێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ!.

هەر یەکە لەو هاوەڵانەی کە لەوێ ئامادەبوون پێی خۆش بوو بۆی دەرکەوێ، و بزانێ جولاس و عومەیر کامیان ڕاست دەکەن، یەکێ لە دڵ نەخۆشەکان وتی: چ کوڕێکی لاسارە ئەیەوێ ئاوا پاداشتی جولاس بداتەوە، هەندێکی تر وتیان: بەڵکو ئەمە منالێکە بە خواپەرستی گەورە بووەو لە شێوەی دەم و چاویدا دەردەکەوێت کە ڕاست بکات.

پێغەمبەریش(ﷺ) ئاوڕی بەلای عومەیری کوڕی سەعدی دایەوەو بینی فرمێسك لە چاوەکانی دێتە خوارەوەو دەڵێ: خوایە گیان! ڕوون کەرەوەی ئەم وتەیەم بۆ بنێرە

خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەت(ﷺ) جۆلاسیش لە ترسی ئەوەی قورئان بێتە خوارەوەو ڕاستی عومەیر دەربخات، بە توندی هەستایە سەر پێ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! ئەوەی من بۆم گێڕایتەوە هەر ئەوە ڕاستە، ئەگەر پێت خۆش بێت هـەردووکمان سـوێندت بۆ دەخۆین من سوێند دەخۆم بەخوا کە هیچی لەوەم نەوتووە کە عومەیری کوڕی سـەعد بۆتی گێڕاوەتەوە.

هەر کە جولاس لە سوێندەکەی بویەوە، خەڵکی ڕوویان کردە عومەیری کوڕی سەعد تا بزانن هەڵوێستی ئەو چۆنە لە سوێند خواردندا.

لەم کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) ئارام و بێدەنگ بـوو هـاوەڵانیش زانیـان کـەوا وەحـی دێتـە سەر، بۆیە لە شوێنی خۆیاندا بێدەنگ دانیشتن و چاویان بڕیبووە پێغەمبەری خوا(ﷺ).

لێرەدا جولاس ترس و لەرز دایگرت و عومەیریش پەلەی بوو هەواڵی تازە بزانێ، زۆر حەزی دەکرد ئەنجامیان دەربکەوێ، خەڵکەکەش هەتا وەحی تەواو بوو هەر چاوەڕوان بوون، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمایشتی خوای بۆ خەڵکەکە خوێندەوە کە تیایدا ڕاستی عومەیرو ناپاکی جولاسی دەرخست کە جولاس ئەو سوێندەی بە ناڕەوا خواردووەو ئەو وتەیەش کە عومەیر لە دەمیەوە گێڕایەوە ڕاستە، بۆیە جۆلاس دوای موسڵمان بوون بێبڕوا بویەوە، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟ ۚ وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ﴾. سورة التوبة ، الآية : (٧٤) .

واتە: (دوو ڕووەکان) سوێند دەخۆن بە خوا (ئەو وتانەی دراوەتە پاڵیان) نەیان وتـوە، بێگومان وتەی بێباوەڕیان وتووە، وەبـێ بـڕوا بوونەتـەوە لـە پـاش موسڵمان بوونیـان، و نیازی شتێکیان بوو بەڵام بۆیان نەکرا (کوشتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتی گەڕانەوەی لـە

تــەبوك)، وەهـیچ ڕەخنــەو ڕقێکیــان نــەبوو تــەنها ئــەوە نــەبێ کــە خــواو پێغەمبەرکــەی (بڕوادارانیان) دەوڵەمەند کردووە لە بەهرەی خۆی[1].

بەڵام خوای خاوەن سۆزو بەزەیی هـەر دوای سـەرەتای ئایەتەکە بەشـی دووهەمیشی نـاردە خـوارەوە، هـەتا یاسـا بـێ بـۆ هــەموو سـەر لێـشێواوێك، کـەوا گەڕانـەوەیان لـێ وەردەگیرێت، بەڵام ئەگەر پشت هەڵکەن و نەگەڕێنەوە ئەوا خـوای پـەروەردگار سزایەکی بــە ئێـشیان دەدات وەکــو ئەفــەرموێ: ﴿فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ وَإِن يَتَوَلَّوْاْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمَا لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾. سورة التوبة، الآية: (٧٤).

واتە: ئەوان بگەڕێنەوەو پەشیمان ببنەوە ئەوە چاکترە بۆیان، وە ئەگەر ڕوو وەرگێڕن ئەوا خوا سزایان دەدات بە سزایەکی سەخت لە دونیـاو پاشـە ڕۆژدا، وە لەزەویـدا نیـە بـۆ ئەوان هیچ دۆست و یارمەتی دەرێك[2].

جولاس کاتێ گوێی لە قورئان بوو بە تایبەتی لەبارەی خۆی و عومەیرەوە گیانی هاتـە لەرزە، کەی بە خەیاڵیدا دەهات بـە تاقـە وتەیـەك ئاوەهـا نـاوی بزڕێـت، و پـەردە لەسـەر دەرونە لە خشتە براوەکەی لابرێت؟ خەریك بوو لە ترساندا زمـانی ببەسـترێ، دوای ئـەوە ئاوڕی بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) دایەوەو وتـی: بـەڵکو ئەگەڕێمـەوە بـۆ لای خـوا، ئـەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! عومـەیری کـوڕی سـەعد(رضي الله عنه) ڕاسـتی کـردو منـیش لـە درۆزنـەکان بووم، داوا لە خوا دەکەم کە ئەم گەڕانەوەیەم لێ وەربگرێ بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)!

بە جارێك جۆلاس چـاوی شـەیتانی کـوێر کـرد، چـونکە ماوەیـەك هـەوڵی دەدا بیخاتـە گومان و دوو دڵیەوە، دوای گەڕانەوەو پاك بوونەوەی جۆلاس پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ڕووی

---

١- پوختەی تەفسیری قورئان، مەلا محەمەد مەلاصالح .

٢- پوختەی تەفسیری قورئان، مەلا محەمەد مەلاصالح .

کردە عومەیری کوڕی سەعد سەیر دەکا فرمێسکی شادی دەم و چاوە پاکەکەی تـەڕبوە بە گریان.

پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستی پـیرۆزی بـۆ گـوێی عومـەیر درێـژ کـردو فـەرموی: ((وَفَّتْ أُذُنك ـ يا غـلام ـ مـا سمعـتُ، وصـدَّقَك ربُّـك)) واتـە: ڕۆڵـە گیـان! گوێـت بـە چـاکی هەواڵەکەی وەرگرت پەروەردگاریش بە ڕاستگۆی دەرکردی.

جـا هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) هەسـتیان بـە دڵ دامـەزراویی جـولاس دەکـرد، و دەیانزانی کە بە جوانی بۆ ئیسلام لـێ بـڕاوە، و لـە جیـاتی ئـەوەی ڕق و کـین لـە عومـەیر هەڵبگرێ، بە پێچەوانەوە لە بەخشش بێبەشی نەدەکردو لە جاران زیاتر خۆشی دەویست، هەر کاتێکیش ناوی عومەیری کوڕی سەعد ببرایە دەیوت: خـوا پاداشـتی چاکەی بداتـەوە منی لە خوانەناسی ڕزگار کرد، و لە ئاگری دۆزەخ لای دام.

بەرکەسێك لەگەڵ ئیسلام ڕاسـت بێـت خـوای گـەورەش ڕاسـتی بـۆ دێنێـت، هیـوادارم ئێمەش وەکو (عومەیری کوڕی سەعد) بین کە چۆن خواو پێغەمبەری خوای خۆشویست[١].

١ـ الاستيعاب: إبن عبـدالبر، الأصـابه فى تمييـز الـصحابه: إبـن حجـر العسقلانى، حليـه الأوليـاو: الأصـبهانى، حيـاه الصحابه: الكاندهلوى، السيره النبويه: إبن هشام، صور من حياه الصحابه: عبدالرحمن الباشا.

# سەرگوزەشتەی چل و یەك

## گفتوگۆیەك لە نێوان منداڵێك و حەجاجی کوری یوسف

یـەکێ لـە سـەربازەکانی حـەجاج گـوێی لـە منـاڵێکی بـچوك دەبێـت بـە خراپـە باسـی حـەجاجی کـوری یوسـف دەکـات، سـەربازەکەش مناڵەکـەی گـرت و هێنـای لەبـەردەم حەجاجی کوری یوسف دابینا کە دانیشتبوو لـەناو وەزیـرو داروەدەسـتەکەی، و خـۆی بـەزل دەزانی لەناو خەڵکی عێراق، کاتێ سەربازەکە مناڵەکەی بەهێزو تەوژمی شـەپۆڵ و سـێڵاو هێنایـە ژوورەوە، مناڵەکـە چـووە لایـان و ڕاوەسـتا لەبـەردەمی حـەجاج و تەماشـای دانیـشتوانی دەکـرد، پاشـان ئـەم ئایەتـەی خوێنـد کـە خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ ﴾. سـورة الـشعراء، الآية: (١٢٨-١٢٩) .

واتە: ئایا ئێوە لە هەموو شوێنێکی بەرز (ی سەرە ڕێگا) بورجێك دروست دەکەن بەبێ هـودە، و چـەند کۆشـك و قـەڵای بـەهێز (کارگـە) دروسـت دەکـەن بـەو ئومێـدەی هـەر بمێننەوەو نەمرن[1] .

لـەو کاتـەدا حـەجاج پـاڵی دابویـەوە بـەڵام کـە گـوێی لـە مناڵەکـە بـوو ئـەم ئایەتـەی خوێندەوە، تەماشای مناڵەکەی کردو وتی: ئەی منالّ! من دەتبینم کە تـۆ منـاڵێکی ژیـرو ژیتەڵ بیت، ئایا قورئانت لەبەرە؟!!

مناڵەکە وتی: ئایا ئەترسیت لەوەی کە قورئان لەناو بچێت تاکو من لەبەری بکەم؟!

حـەجاجیش تێگەیـشت کـە پرسـیارەکەی هەڵەیـە، وتـی بـە مناڵەکـە: ئایـا قورئانـت کۆکردۆتەوە؟

---

١- پوختەی تەفسیری قورئان، مەلا محمد مەلا صالح .

مناڵەکە وتی: بۆچی قورئان پارچە پارچە بووە تاوەکو من کۆی بکەمەوە؟ حەجاجیش تێگەیشت کە پرسیارەکەی هەڵەیە، وتی: ((أفاستظهرت القرآن))؟

مناڵەکەش وتی: پەنا بەخوا ((أن أجعل القرآن وراء ظهري)).

حەجاج وتی: خوا بتکوژێ ! ئەی چی بڵێم؟

مناڵەکە وتی: ئەگەر ویستت پرسیار بکەیت بڵێ: ئایا قورئانت لەبەر کردوە لەناو سینگت؟

حەجاجیش وتی: ئایا قورئانت لەبەر کردوە لەناو سینگت؟

منداڵەکەش وتی: سوپاس بۆ خوا هەمووم لەبەر کردوە.

حەجاج وتی: هەندێ قورئانم بۆ بخوێنە، مناڵەکەش دانیشت و وتی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ۝٣﴾.سورة النصر، الآية : (١-٣)

واتە: کاتێ کە یارمەتی و کۆمەکی خوا هات بەگەڵ سەرکەوتن (شاری مەککە ئازاد کرا))، وە خەڵکت دی کە پۆل پۆل دێنە ناو ئایینی خواوە، ئەوسا ئیتر پەروەردگارت بە پاك ڕابگرە بە هۆی ستایشیەوە، و داوای لێبوردنی لێ بکەن، چونکە بێگومان ئەو زۆر گیراکەری پەشیمانیە[١].

پاشان ئاوڕی بەلای حەجاجی دادایەوەو وتی: لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) خەڵك پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە، بەڵام لەم سەردەمەی تۆ خەڵکی پۆل پۆل لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دێنە دەرەوە ئەی حەجاج.

حەجاج وتی: تیا بچیت و بفەوتێیت، ئایا نازانیت لەگەڵ کێ قسە دەکەی؟

---

١ـ پوختەی تەفسیری قورئان ، مەلا محمد مەلا صالح .

منداڵەکەش وتی: لەگەڵ حەجاجی کوڕی یوسف.

حەجاجیش بە دانیشتوانی وت: چی دەڵێن دەربارەی ئەم منداڵە؟

دانیـشتوان وتیـان: بیکـوژە چـونکە ئەمـە لـەژێر ملکەچـی تـۆ دەرچـووەو لـە کۆمـەڵ جودابوتەوە!

منداڵەکەش بە حەجاجی وت: ئەی حەجاج، دانیشتوانی فیرعەون گـەلێك باشـتربوون لـە دانیشتوانی تۆ.

حەجاج وتی: چۆن؟

منداڵەکە وتی: دانیشتوانی فیرعەون کاتێك پرسیاریان کـرد دەربـارەی (موسـاو هـارون) وتیان: ﴿قَالُوٓاْ أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ﴾. سورة الأعراف ، الآية : (١١١) .

واتە: ئەوانیش وتیان: کاری (مووسا)و براکەی دوا بخە[١].

بەڵام ئەوانەی لای تۆ دانیشتون دەڵێن: بیکوژە.

حەجاج وتی: لەبارەی پێشەوای موسڵمانان چی دەڵێیت؟

منداڵەکە وتی: خوای پەروەردگار لە باوکی حەسەن ڕازی بێت (واتە پێشەوا عەلی).

حەجاج وتی: مەبەسـتم پێـشەوا عـەلی(رضي الله عنه) نیـە، مەبەسـتم لـە (عبدوالمـەلیکی کـوڕی مەڕوانە).

منداڵەکە وتی: علیه من الله ما یستحقه.

حەجاج وتی: تیا بچیت و بفەوتێیت لەبەرچی؟

منداڵەکە وتی: تۆ گەورەترین تاوانت ئەنجام داوە.

حەجاج وتی: ئەم تاوانە چیە؟

---

١ـ پوختەی تەفسیری قورئان ، مەلا محمد مەلا صالح .

منداڵەکە وتی: تۆ خوێن و ماڵی موسڵمانانت حەڵاڵ کردووە.

حەجاجیش ئاوڕی بەلای منداڵەکەی داوەو وتی: سوێند بەخوا ئەوا لێت خۆش بووم، فەرمانیشی دەرکرد کەوا (١٠٠٠٠٠) هەزار درهەمی بداتێ، لەبەر ئەوەی پشتت بە خوای پەروەردگارت بەستووە.

منداڵەکەش وتی: لێبوردن تەنها بە دەست خوای گەورەیە بە دەستی تۆ نیە، گەورەییو بەخشش هی خوایە هی تۆ نیە، ((ولا جمع الله بيني وبينك))، پاشان چۆوە دەرەوە[1].

---

١ـ الآيمان بالقچاو والقدر، محمد حسان، ص ٢٦٣ .

# سەرگوزەشتەی چل و دوو

# نوێژی بەیانی

منداڵێکی تەمەن (٧–٨) ساڵ لەگەڵ باوکیدا ئامادەی کۆڕێك دەبێت، لە کۆڕەکەدا منداڵەکە گوێی لەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) دەبێت کە دەفەرموێت: ((مَنْ صلَّ الصُبح في الجماعةِ فهو في ذمةِ الله))[١].

واتە: هەرکەسێك نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ ئەنجام بدات، ئەوا لە پارێزگاری خوادا دەبێت.

لە دوای کۆڕو دانیشتنەکە، منداڵەکە بە باوکی دەڵێت: بابە، بەیانی بۆ نوێژی بەکۆمەڵ هەڵمسێنە.

باوکیشی وادەزانێت منداڵەکە تەنها ئێستا دڵی گەرمەو بەیانی لەبیری دەچێتەوە، بۆیە بە کورەکەی دەڵێت: باشە (إنشاءالله).. منداڵەکە دەڵێت: ئەگەر هەڵم نەسێنی، ناچم بۆ قوتابخانە..

بەیانی باوکی بەتەنها دەچێت بۆ مزگەوت و هەڵی ناسێنێ.. منداڵەکەش دەڵێت: لەبەر ئەوەی هەڵت نەساندم ناچم بۆ قوتابخانە.. باوکی زۆر هەوڵی لەگەڵ دەدات، کە بچێت بۆ قوتابخانە، چونکە وانەکانی دەفەوتێت، بەڵام بێ سوود دەبێت..

بۆ ڕۆژی دوایی باوکەکە منداڵەکەی خەبەر دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی لە قوتابخانە دوانەکەوێت و خوێندنەکەی نەفەوتێت.. منداڵەکە بە دڵێکی خۆشەوە دەچێت بۆ مزگەوتو نوێژەکەی ئەنجام دەدات، لە ڕێگەی گەڕانەوەدا بەباوکی دەڵێت: بابە ئێستا من لە پارێزگاری خوادام؟! باوکیشی دەڵێت: بەڵێ کورم، لەبەر ئەوەی ئەم بەیانیە بە کۆمەڵ نوێژەکەت ئەنجامدا...

---

[١] رواه مسلم: رقم : (٦٥٧).

بەیانی، منداڵەکە دەچێت بۆ قوتابخانە، ئەو قوتابیانـەی کـە ڕۆژی پێشوو نـەهاتبوون، مامۆستا بانگی کردنـە دەرەوەو یـەك یـەك سـزای دان، لەبـەر ئـەوەی وانـەکانیان ئامـادە نەکردبوو، هەتا سەرە گەیشتە منداڵەکە.. مامۆستا ویستی سزای بدات، بـەڵام منداڵەکـە بـە مامۆستای وت: ناتوانی سـزام بـدەی! مامۆسـتا بەسـەر سـوڕمانەوە وتـی: چـی؟! چـۆن ناتوانم سزات بدەم؟! منداڵەکە وتـی: چـونکە پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێت: (هـەر کەسـێك نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ ئەنجام بدات، خودای گەورە پارێزگاری لیٚ دەکات و دەیپارێزیٚ)، منیش ئەمڕۆ نوێژی بەیانیم بە کۆمەڵ ئەنجام داوە، لەبەر ئەوە من لە پارێزگاری خوادام و نـاتوانی سـزام بـدەیت.. مامۆسـتاش زەردەخەنـە کەوتـە سـەر لێـوی و بـە پێکەنینـەوە ئافەرینی منداڵەکەی کرد لە جیاتی سزادان[1].

---

١ کاسێتی (أنين الفجر) و نزای سەحەر: هێمن محمد علی.

# سەرگوزەشتەی چل و سێ

## بۆچی دەگریت؟

شەوێك باوكێك لە كاتێكی درەنگدا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ، لـە ژووری كوڕەكەیـەوە گـوێی لە دەنگی گریان دەبێت!! دەچێت بۆ لای كوڕكـەیو لێـی دەپرسـێ: بۆچـی دەگریـت؟! كوڕەكەی پێی دەڵێت: بۆ فلاّنە دراوسێمان دەگریم...

بـاوكی بەسەرسـوڕمانەوە دەڵێـت: ئـەوە گریـانی بـۆ چـیە؟! پیرەمێردێك مـردووە، تەمـــەنێكی درێژیـــشی بەســـەر بـــردووە.. گومـــانم وابـــوو كارەســـاتێكی گـــەورەمان بەسەرهاتووە!! ئەم هەموو گریانە بـۆ ئـەو پیرەمێـردە؟ خـۆ ئەگـەر مـن بمردمایـە، بـەم شێوەیە بۆم نەدەگریایت!! كوڕەكە بەچاوی پڕ لە فرمێسكەوە سەیری باوكی كردو وتی: بەڵێ... بەم شێوەیە بۆت نەدەگریام، لەبەر ئەوەی ئـەو پیـاوە بـوو، كـە دەسـتی گـرتم و بەرەو مزگەوت و نوێژی بەكۆمەڵی بردم.. فێری ئەوەی كردم كە نوێژی بەیانیان بە كۆمەڵ ئـەنجام بـدەم.. ئامۆژگـاری دەكـردم هـاوەڵی چـاكەكاران بم و لــە هــاوڕێی خــراپ دووربكەومەوە.. هەر ئەو بوو هانی دەدام بۆ ئەوەی قورئان لەبـەر بكـەم.. بـەڵام هـەر تـۆ بەناو باوكمیت!! كەی ئامۆژگاریەكت كردووم؟! ئەو پیرەمێردە باوكی ڕاستەقینەم بـوو، پێویستە بۆ ئەو بگریم..

لەم كاتەدا باوكەكە لە خەوی بێ ئاگایی بەخەبـەر دێـت.. قـسەكانی جگـەر گۆشـەكەی كاریان تێكردو چاوەكانی پڕبوون لە فرمێسك.. كوڕەكـەی لـەباوەش گـرت و پـەیمانیـدا لـە داهاتودا هەموو نوێژەكانی بەكۆمەڵ لە مزگەوتدا ئەنجام بدات[1].

---

[1] دموع المحراب و نزای سەحەر: هێمن محمد علی.

# سەرگوزەشتەی چل و چوار

## ئەبو حەنیفەو چاوی عەقڵ[٧]

ئەبو یوسـف، یـەعقوبی کـوری ئیـبراهیم یەکێکـە لـە قوتابیـە ژیـرو زیرەکـەکانی (ئـەبو حەنیفە) هەردەم کاتەکانی خـۆی تـەرخان کردبـوو بـۆ فێربـوونی زانسـتی شـەرعی لـەلای (ئەبو حەنیفە)، ئەمجا (ئەبو یوسف) چەمکێك لە ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە کە لەگەڵ (ئەبو حەنیفە)دا ژیاوەو دەڵێـت: مـن منـاڵێکی تەمـەن پێـنج سـاڵان بـووم، دەچـومە لای (ئـەبو حەنیفە) زانستی حەدیس و فیقهم دەخوێند، بەڵام لە ڕووی ماددیەوە زۆر دەست کـورت و نەداربووم لە ماڵەوە، هەتا جارێکیان لە کاتی دەرس خوێندن باوکم هاتـە ژوورەوەو وتـی: کوڕم پێت لەگەڵ پێی (ئەبو حەنیفـە) درێـژ مەکـە تـۆ هـەژاریت و (ئـەبو حەنیفـە)ش هـەر دەنانی برژاوە بڕۆ بۆخۆت ئیشێك بکە باشترە، دەڵێ: منیش بەهۆی ئەمە زۆر دواکەوتم لە دەرسـەکان، بـەڵام (ئـەبو حەنیفـە) هـەر پرسـیاری دەکـردم و دەیفـەرموو: کـوانێ (ئـەبو یوسف) بۆ دیار نیە، ئەمجا دەڵێ پاش ماوەیەك خۆم پێ ڕانەگیراو هەر چـوومە لای بـەبێ زانینی باوکم، کاتێك (ئەبو حەنیفە) منی بینی وتی: ها چ دەکەی؟ بـۆ دیـار نیـت؟ منـیش وتم: بە ئیش و کارو گوێڕایـەڵی بـاوکم سـەرقاڵم، لـە پـاش دەرس خوێنـدنم نەڕۆیـشتمەوە لەلای ئەو هەتا قوتابیەکان ڕۆیـشتن، ئـەمجا (ئـەبو حەنیفـە) وتـی: ئـەم کیسـەیە بگـرە.. دەڵێ: منـیش کیسـەکەم کـردەوە دەبیـنم سـەد دیرهـەمی تیایـە پاشـان وتـی: بەشـداری بازنەی دەرسی خوێندمان بکەو هەر کاتێ ئەو پارەیە تەواو بـوو هـەواڵم پـێ بـدە، دەڵـێ: ماوەیەکی کەم بەسەر ئەم سەد درهەمەدا تێپەڕی سـەد دیرهـەمی دیکـەی پێـدام، دەڵـێ: منیش هەرگیز هەواڵم پێ نەدەدا بە تەواو بـوونی، بـەڵام ئـەو دەتـوت یـەکێك هـەواڵی پـێ دەدا کە تەواو بووە، پاشان (ئەبو یوسف) دەڵێـت: هـەتا مـن حـاڵم زۆر بـاش بـوو، بـەڵام کاتێك باوکم وەفاتی کرد دایکم منی لەلای بەرگ درویەك دانا هەتا ئیشی لەلا بکـەم، بـەڵام

من بەگوێم نەدەکرد، هەتا ڕۆژێکیان هاتە لای (ئەبو حەنیفە)و وتی: بۆ لێـی ناگـەڕێی ئـەو منداڵە ئیش بکـات. ئایا تـۆ نـازانی ئـەوە بـاوکی نـەماوەو مـن مەسـرەفی دەکێشم؟ (ئـەبو حنەیفە)ش وتی: کوا کوڕەکەت لێی گەڕێ با فێری زانست بێ کێ دەڵێت ڕۆژێـك لـە ڕۆژان حەلوا بە ڕۆنی فستق ناخوات؟ لەو کاتەدا ئەم جۆرە خواردنە تەنها خواردنی پاشاو مەلیك بوو، ئەمجا دایکی (ئـەبو یوسـف) دەڵـێ: بـەخوای تـۆ پیرەمێردێکـی بـێ ئـەقڵی یەکسەر دەچێتە دەرەوە، پاشان (ئەبو یوسف) درێژە بە باسەکەی دەدات، دەڵـێ: خـوای گـەورە زۆر سودی پێ گەیاندم، بەهۆی زانستەوە زۆر بەرزی کردمەوە هـەتا لەسـەردەمی خەلیفـە (هارونە ڕەشید) بووم بە (قازی)، بەڵام پـاش ماوەیـەکی کـەم لـە ئـیش کـردنم لـە (قـەزا) هارونە رەشید منی کردە (قاضي القضاة) واتە: ئەو کەسەی قازی دەنێرێتە شوێنی تر.

ئەمجا دەڵێ: من و هارونە رەشید لەسەر یەك سفرە نانمان دەخوارد، زۆربەی کات هەر لەلای ئەو بووم، هەتا ڕۆژێکیان خواردنێکیـان بـۆ هارونـە رەشـید هێنـا وتـی: وەرە (ئـەبو یوسف) ئەو خواردنە بخۆین، چونکە ئەو خواردنە بۆمان ئامادە ناکرێت، (ئەبو یوسف)یش وتی: ئەو خواردنە چیە؟ ئـەویش وتـی: حەڵوایـە بـەڕۆنی فـستق، ئـەویش زەردەخنەیـەك بەسەر لێویدا دێت، و دەڵێت: بۆچی پێ دەکـەنیت؟ ئـەویش دەڵـێ: هـیچ نیـە، خەلیفـەش دەڵێ: دەبێت هەر پێم بڵێی، (ئەبو یوسف)یش سەرگوزەشتەکەی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە بە تەواوی، خەلیفەش زۆر سەر سوڕمان دەبێت، بۆیە وتی: ڕەحمەتی خوا لە (ئەبو حەنیفـە) بێ ئەوەندەی بەچاوی ئەقڵ دیدی بەچاوی سەر نەیدی.

# سەرگوزەشتەی چل و پێنج

# كیشوەری پاكیزەیی منداڵ

لە منداڵێكم پرسی: گەر ناوەكەت بگۆڕی.. حەز دەكـەیت چ ناوێـك هەڵبـژێریت؟ هەسـتم كرد پرسیارەكەم ناوجەرگەی دەرونی هەژاند، كەمێك بەچاوە ڕەشـەكانی لـێم وردبـووەوە دیـاربوو ناوێـك لـە مێـشكیدا نەخـشابوو كـە زۆر عاشـقی بـوو، لێوەكـانی لێـك ترازانـدو بەدەنگێكی نەرم و بڕوایەكی پتەوەوە وتی: بەهەشت!!

منداڵ پاكە.. چ وشەیەك لە پاك شیاوترە بۆ منداڵ؟

چونكە پێش هەموو شـتێك كـائینێكی پاكـە.. دڵـی پاكـە.. مێـشك و دەروونـی پاكـە.. وتەكانی لە زارێكی پاكەوە دەردەچن.

# سەرگوزەشتەی چل و شەش

# مافی دایك و بـاوك

دەگێڕنـەوە: کوڕێـك دوای ئـەوەی دەبێتـە خـاوەنی ژن و منـاڵ، بـاوکی پـیر دەبێـت و ماوەیەك خزمەتی دەکات، ماندوو دەبێت بە دەستیەوەو هاوسەرەکەشـی دەسـت دەکـات بە بۆڵە بۆڵ و بەردەوام دەڵێت: ئەمە حاڵ نیە ئێمە تیاین، خـوا بیـبڕێ ئـەم حاڵـەو ئەمـە ژیـان نیـە بەدەسـت ئـەم پـیرەوە بەسـەری دەبـەین، تـا ئێـرە هـەر بـاش دەبێـت بـاوکی دەتوانێت بجوڵێ و بچێتە دەرەوەو بگەڕێتـەوە بـەرەو مـاڵ، بـەڵام جـار جـارە لـە بێزاریـا دەرگاکەی بۆ ناکەنەوە، کوڕێکیان دەبێت هەر چەند بچووك دەبێت بەڵام عاقڵ، جـار جـار دەگەڕێتەوە باوای لەبەر دەرگاکەیەو بە باوەلێ باوەلێ دەیباتە ژوورەوە، دایکیشی تـوڕە دەبێت و هەڕەشـەی لـێ دەکـات کـە جـارێکی تـر نەیهێنێتـەوە لەگـەڵ خـۆی، ئێوارەیـەك ژنەکەی زۆری بۆ دەهێنێ کە دەبێت باوکت بکەیتە دەرەوەو لە کۆڵان بە جێی بهێڵـی، بـە ناچاری دەیکاتە دەرەوە، کوڕەکەشـیان دەڵێـت: بابـە سـەرمای دەبێـت و بـا شـتێکی بـۆ بەرین دایپۆشین، باوکیشی دەڵێ بچۆ لێفە شـڕەکە بێنـەو بـۆی بـەرە، کوڕەکـەش لێفەکـە دەهێنێ و دەڵێ: بە باوکی بیگرە با بـەم چـەقۆیە بیکـەین بـە دوو بەشـەوە، باوکیـشی وا دەزانێت مەبەستی ئەوەیە لەتێکی بۆ ژێری و بە لەتەکەی تریشی دایپۆشێ، دەڵـێ: کـوڕم شـتێکی باشـت کـرد وای لێ بکـە، دەڵـێ: باوکـە ئـەم لەتـەی بـۆ بـاوام و ئـەم لەتـەیش هەڵدەگرین، دەڵێ: کوڕم بۆچی؟ دەڵێ بۆ ئەوەی هەر کاتێ تۆش پیربوویت و وات لێهـات منـیش ئـەم لەتـەی بـەکاربهێنم بـۆ تـۆ، لەوێـدا بـاوکی بـە ئاگـا دێتـەوەو قوڵپـەی گریـان دەیگرێو هەڵوێستی جوان و دەرون پاکی کوڕەکە کار دەکاتە سـەر بـاوك و دایـك، بـاوکی دەهێنێتە ژوورەوەو بڕیاردەدەن تا لە ژیاندابن بەوپەڕی ڕێزەوە خزمەتی بکەن، ئـیتر لـەو ڕۆژەوە هێمنی و ئارامی باڵ دەکێشێ بە سەریانا و بە ئاسودەیی دەژین.

ئەم سەرگوزەشتەیە فێرمان دەکات کە:

١- لەمرۆدا پێشبینی بەیانی بکەین، و داهاتوو بخوێنینەوە، چونکە ڕۆژان ڕۆژیان لە دوایە.

٢- فێرمان دەکات کە چاکەکاربین لەگەڵ دایك و باوکماندا، و هەر چۆن ئێمەیان بە سۆزو خۆشەویستیەوە گەورە کرد، ئێمە بە پیریا خزمەتی ئەوان بکەین.

٣- ئەم سەرگوزەشتەیە پێمان دەڵێ کەسێك بۆ خۆی و دایك و باوکی خۆی نەبێت، بۆ کەسانی تریش چاوەڕوانی خێری لێناکرێت لە کۆمەڵگەدا.

٤- فێرمان دەکات چۆن ئامۆژگاری کەسانی لە خۆمان گەورەتر بکەین، و کاریگەریشی هەبێت لەسەریان[1].

[1] گۆڤاری بریار، ژمارە (١٧)، لا (٣٩).

# سەرگوزەشتەی چل و حەوت

## شەریفۆ

شەریفۆ ئەو منالەی حەماسەت و جولەی موسـلمانانی ئەفـەریقیای زیـاد کـرد، شـەریفۆ سـەردەمی خـەوارق و سـەیرەکان دووبـارە دەکاتـەوە، تەمـەنی تـەنها (پێـنج) سـالە، شوێنکەوتوانی دەیان هەزارە.

هـەر کاتێـك لـە شـەقامێکەوە دەڕوات خـەلکی هـەمووی لەگـەلی دەبـن و بـە پـیرۆزی دەزانن، ڕوو بکاتە هەچ مزگەوتێك جێگەی دانیشتن و نوێژکردن نامێنێـت، یەکـەم کۆمەلـە وشە بە زمانی دەری بڕیـوە لـە تەمـەنی چـوار مانگیـدا بـووە، هـەر چـەندە ئـەو کاتـە لـە خێزانێکی مەسیحی کاسۆلیکی بوو.. یەکەم وشەی (الله أکبر) بوو چەند بارەی دەکـردەوە بەشێوەی خۆی و بە زمانی عەرەبی و بە زوبانێکی پاڕاوو بیـستراو، کاتێـك بـاوك و دایکـی زانیان (الله أکبر) دروشمی موسلمانانە، وردە وردە هاتن بەرەو ئیـسلام، شـەریفۆ جێگـەی سەرنجی پایتەختی سەنغالە.

خەلکێکی زۆرو دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە شوێنی دەبن هـەر چـەندە حـەز بـە وێنـەگرتن ناکات، بەلام یەکێك لە وێنـەگرە فەڕەنـسیەکان ئـەو تـەوق و بازنـەیی شـکاندو گەیـشتەی لای‌و وێنەی گرت.

جەماوەرێکی زۆر ئەو منالە تەمەن پێنج سالەیان لە ئامێز گرتووە ((واکـیر) مـامی ئـەم منالەیە دەلێت: کاتێك شەریفۆ گەیشتە تەمەنی سێ سالان سورەی ئیخلاصی چـەند بـارە دەکـردەوە هـەتا دەخـەوت، تواناو زیرەکیـەکی بـێ وێنـەی هەیە، بـە چـەند زمـان قـسە دەکات، ئینگلیزی و عەرەبی و فەرەنسی دەزانێت، بێجگە لە زمانی خـۆی کـە سـەواحیلیە کە هەمووی لە ڕێگەی بیستنەوە فێربووە.

ڕۆژنامە نووسی فەڕەنسی (تۆماس جونیو) دەڵێت: مـن گـوێم لـێ بـوو زۆر بەباشـی بـە فەرەنسی قسەی کردوە، هەر چەندە دەسەڵات دارانی سەنغالی نیگەرانن بەو جەماوەرەی بوونەی (شەریفۆ)، و دەیانەوێت کەمی بکەنـەوە، بـەڵام بـەردەوام لـە زیـادبوون دایـە، لـە یەکەم ڕۆژی سەردانەکەیدا بۆ (دەکار) پانزە هەزار کەس لەبەردەمیدا دانیشتبوون گوێیان لە قورئان خوێندنی شەریفۆ گرتبوو.

کاتێك شەریفۆ دەست نیشانی مزگەوتێکی کرد بۆ نوێژی هەینی (شەست) هـەزار کـەس ئامادەی ئەو جومعەیە دەبون، کاتێك بەسەر شەقامە سەرەکیەکەی شاردا بە ئۆتۆمبێلێـك ڕۆیشت، جـەماوەرێکی زۆری هیتـاڤ (الله أکـبر) یـان دەکێـشاو دەکەوتنـە دوایـی، و داوای نزای خێریان بـۆ دەکـرد، تـەنها لەسـەنغال ناوەسـتێ، بـەڵکو دەچـێتە وڵاتـانی تـر باسـی ئیسلام دەکات، و بە زمانێکی زۆر پاراو قورئان دەخوێنێت لەناو خەڵکیدا، سەردانی لیبیاو ساحلی عـاج و کینیـای کـردوە، لـە هەموویانـدا بووەتـە جێگـەی سەرسـوڕمانی خـەڵکی و دەزگاکانی ڕاگەیاندن و چینێکی بەرفرەوانی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە، ئەوەندە مـاوە بڵـێین شەریفۆ مناڵێکی بچوکەو پێش چەند ساڵێك لە دایك بووە[١].

---

١ درود، فاتح شیخ محمد سمیع، بەرگی چوارەم، لا٤٢، چاپی یەکەم، چاپخانەی چوار چرا.

# سەرگوزەشتەی چل و هەشت

# تەنها خەندەیەك

بۆ بەخشینی شادمانی و میهروسۆزو خۆشەویستی زۆر جار تـەنها خەندەیـەك بەسـە، چرپەی دوو وشـەی ناسك و نیگایـەکی نـورین بەسـە بـۆ هـەڵکردنی شنەو شـەماڵی هیـوا بەخش و شادی هێن و خەفەتبەر.

بەڵام بەداخەوە زۆرجار بەرامبەر بە کارێکی وەها ئاسان و سانا سستی دەنوێنین!

لە کاتێکدا خەندەو وتەی شیرین کاریگەریەکی ئەفسوناوی هەیە، و وادەکات لە قوڵـایی دڵەکاندا جێگای خۆمان و دەوروبەر نوقمی سەعادەت و سەرفرازی بکەین.

با بەیەکەوە سەرنج لە هەڵوێستی ئەم منداڵە هەست ناسك و دڵپاکە بدەین، و وانەیـەکی بەرزی لێوە فێر بین:

منداڵێك لەگەڵ باوك و دایکیدا دەچنە نوێژی هەینی، لە وتاری هەینیدا مامۆستا باس لـە بەخشین و پاداشتی بەخشندەیی دەکات، ئەمیش زۆر ئارەزوو دەکات کە بیتوانیایە پارەو سامانی بە هەژاران و لێقەوماوان ببەخشیایە، لەبەر ئەوە دوای نوێژی هەینی لە مامۆستای وتاربێژ نزیك بویەوەو بە خەمباریەوە لێی پرسـی: مامۆسـتا گیـان! مـن زۆر حـەز دەکـەم یارمەتی هەژاران بدەم، بەڵام هیچ پارەیەکم نیە.

مامۆستاش بەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستیەوە ڕووی تێکردو پێـی گـوت: ڕۆڵـەی شـیرینم بەخـشین تـەنها بـە پـارە نابێـت، بـەڵکو دەتوانیـت بەشـێك لـە کاتـەکانت ببەخـشی بـۆ جێبەجێکردنی کارو پێداویستیەکانی ئەو کەسانەی کە پێویستیان پێتە.

تەنانەت بەخشینی خەندەیەك بەخێرو بەخشین دەژمێردرێت.

منداڵەکە بەم وتانە دڵخۆشبوو، یەکسەر دەستی دایك و باوکی گرت و وتی: دایـە گیـان! بابە گیان! چی بکەین؟

باوکی گوتی: دەچین بۆ نەخۆشخانەکان و سەردانی نەخۆشەکان دەکەین و هەواڵیان دەپرسین و دڵخۆشیان دەکەین.

هاوکات هەر سێکیان چوونە نەخۆشخانەیەك لەوێدا چاویان بە پیرەژنێکی نەخۆش کەوت کە تەمەنی (٩٢) ساڵ بوو، شێرپەنجە بەهەموو لاشەیدا بڵاوببۆوە، کاتێك چاوی هەڵێناو ئەمانی بینی گوتی: من (٨) مانگە لەم نەخۆشخانەیەم و (١٤) ساڵە لەم نەخۆشخانە بۆ ئەو نەخۆشخانە دەمگوازنەوە! زۆربەی نەخۆشەکانی دەوروبەرم مردن و تەنها من ماومەتەوە، تاڵاویی نەخۆشی و تەنیایی دەنۆشم و هەمیشە لەخەودا دەپاڕامەوە کە کەسێك بێتە لام، خۆشی بوێم و خۆشم بووێت، و هەواڵم بپرسێ و لەم تەنیاییە رزگارم بکات، تا ئێستاش کەس سەردانی نەکردووم و لێی نەپرسیومەتەوە! زۆر سوپاسی ئێوە دەکەم و تا دوا هەناسە دوعای خێرت بۆ دەکەم.

ڕۆژێکیان هات بۆ سەردانی پیرێژنەکە بینی قەرەوەڵێکەی چۆڵەو کۆچی دوایی کردووە، تەنها پارچە کاغەزێکی بینی کە لەسەر چەرچەفە سپیەکەی بەجێی هێشتبوو، تیایدا نووسرابوو.. هەر چییەك بڵێم ناتوانم سوپاست بکەم، ئەوەندە دەڵێم سوپاس بۆ خودا بە ڕاستی لەناخی دڵمەوە خۆشم دەوێیت، من لەم دونیایەدا کەسم نیە لەبەر ئەوە بڕیارمدا هەموو سەروەتەکەم دوای خۆم ببەخشم بە تۆ، کە بریتیە لە(٢) ملیۆن دۆلار!.

خوێنەری بەڕێز: ژیری ئەم منالە تەنها لە پاداشتی خەندەیەکی جوان و وتەیەکی خۆشدایە، چی دەبێت ئەگەر هیچمان لە تواناادا نەبوو بۆ ئەوەی بیبەخشین، خەندەو بزەی سەر لێوو وشە جوانەکانمان بکەینە خەڵات و گوڵ پرژێنی دڵەکانی پێ بکەین!!

# سەرگوزەشتەی چل و نۆ

## منداڵێکی تەمەن ( ١١ ) ساڵەی نابینا

مناڵێکی تەمـەن (١١) سـاڵەی میسری ئیمامـەت و وتاربێـژی هـەینی بـۆ نوێـژ خوێنـان دەکات لە مزگەوتی (ال فرج بالبدرشـین) ی باشوری شـاری قـاهیرەی پایتـەختی میسر و هەمیشەش مزگەوتەکەی جمەی دێت لە نوێژ خوێنان.

(سلام محمد الدسوقی) ئەو مناڵە بە توانایەیە کە زیرەکی و توانا زۆرەکـانی سـەرنجی موسڵمانان و نوێژ خوێنانی بۆ خۆی ڕاکێشاوەو لە شوێنی زۆر دوورەوە دێـن بـۆ گـوێگرتن لە وتارەکانی ڕۆژی هەینی، و سەرجەم قورئانی لەبەرە، و هەر لە تەمەنێکی زۆر مناڵیـەوە تواناکانی بە دیار کەوتوون...

باوکی (دسوقی) لەبارەی کوڕەکەیـەوە دەڵێـت: هـەر لـە مناڵیـەوە بـۆم دەرکـەوت کـە کورەکەم زۆر بەتوانایە، کاتێك کـە دەمبـینی لاسایی شـێخ و زانـا گـەورەکان دەکاتـەوەو گوێیان لێ دەگرێت، کاتێکیش کە دەچوینە مزگـەوت بـۆ ئەنجامـدانی نوێـژی هـەینی، کـە دەهاتینـــەوە کوڕەکـــەم دەچـــووە ســـەر کورســـیەك و ئـــەوەی مامۆســـتاکە وتبـــووی بەحەماسەتەوە دەیوتەوە.

ئەمەو ئێستا (سـلام محمـد) لـە پـەیمانگای خوێندنـەوەکانی سـەر بـە زانکـۆی ئەزهـەر دەخوێنێت و مامۆستاکانی دەڵێن: لە تەمەنی شەش سـاڵی قورئـانی لەبـەر کـرد، هـەر لـە مناڵیەوە چاوەکانی نابینا بوون و نوێژ خوێنانی مزگەوتی (ال فـرجیش) زۆر بـە تواناکـانی واردان و قورئـان خوێنـدنی ئـەو مناڵـە بەهرەمەنـدە سەرسـامن، سـەلام بۆخۆشـی ئاواتـە خوازە بگاتە پلەی ئەو زانـاو مامۆسـتاو وتاربێـژە بەناوبانگـەگانی جیهـانی ئیـسلامی، کـە خەڵکی لە وڵاتانی تـرەوە بـۆ گـوێ بیـست بـوونی وتارەکانیـان گەشـت دەکـەن و ئامـادە دەبن[١].

---

١ www.bextewery.com.

# سەرگوزەشتەی پەنجا

# ئیبنو تەیمیە

ئیبنـو تەیمیـە بـە منـاڵی توانایـەکی زۆری لەبـەرکردنی هـەبوە، تەنانـەت لـەو بـوارەدا ناوبانگی دەرکردبوو، زانایەکی حەلەبی هاتە دیمەشق و ناوبانگی ئیبنو تەیمیەی بیستبوو، وتی: بیستومە لای ئێوە کوڕێك هەیە پێی دەڵێن: ئەحمەد کە لە لەبەرکردندا خێرایـە، جـا هاتووم بەڵکو ببینم، ئەمجا ڕێنموونی کرا تـا چـاوەڕوانی بکـات، کـە ئیبنـو تەیمیـە هـات لەوحێکی پێبوو، زانای حەلەبی لەوحەکەی سەیر کردو داوای لە ئیبنو تەیمیە کرد تـا چـی تێدا نوسراوە بیسڕێتەوە تا شتێکی پێ بڵێت و بینوسێت، ئـەویش نوسـینەکەی سڕیەوەو زاناکەش دەقی چەند فەرمودەیەکی پێوت کە یانزە یـان سـیانزە فـەرموودە دەبـوون، بـە ئیبنـو تەیمیـەی وت: ئـەوە بخوێنـەرەوە، ئـەویش سـەیرێکی نووسـینەکەی کـردو پاشـان لەوحەکەی لابردو بەبێ هەڵە فەرمودەکانی بۆ وتەوە، پاشان زانـای حەلـەبی ئەوەشـی بـۆ سـڕیەوەو چـەند سـەنەدێکی فـەرموودەی پێنوسـی، ئیبنـو تەیمیـە وەك جـاری پێـشوو هەمووی بۆ وتەوە، زانای حەلەبی سەرسام بـوو و وتـی: ئەگـەر ئـەم کـوڕە بمینێـت ڕۆڵ و کاریگەریەکی گەورەی دەبێت، چونکە شتی وانەبینراوە.

ئیبنو تەیمیە تەمـەنی منـاڵی تێنەپەڕانـدبوو، ڕۆژێـك بـاوکی بڕیاریـدا مناڵـەکانی بباتـە دەرەوە بۆ گەڕان، بە ئەحمەدی وت: لەگەڵ براکانت وەرە با کـەمێك بحەسـێیتەوە، بـەڵام ئیبنو تەیمیە حەزینەکرد هەرچەندە بـاوکی پێیـوت، بـەڵام ئەحمـەد داوای کـرد نەچـێت و بمێنێتەوەو وتی: وام پێخۆشە ڕێم پێ بدەیت نەیەم، باوکیشی ڕازی بوو، و مناڵەکانی تری برد، کاتێك ئێوارە گەڕانەوە باوکی جۆرە لۆمەیـەکی کـرد کـە چ سـودێکت بـینی نـەهاتی، ئەحمەد وتـی: ئـەمڕۆ ئـەم کتێبـەم لەبـەر کـردووە، بـاوکی بـڕوای نـەبوو تـوانیبێتی شـتی وابکات، بۆیە کتێبەکەی لێوەرگرت و لێی پرسیەوە، ئەحمەد هەمووی بە لەبەرکردنەوە بۆ خوێندەوە، باوکیشی لـە ترسـی ناحـەزان وتـی: کـوڕی شـیرینم بەکـەس مـەڵێ شـتی وات کردووە.

# سەرگوزەشتەی پەنجاو یەك

# لە خۆبایی بوون

جارێکیان (أبو العلاء المعری) لـە شـوێنێکدا زۆر لـە خۆبـایی دەبێـت، و ئەیـەوێ خـۆی هەڵکێشێت و دەڵێت: من دەتوانم شتی وا بکەم و بڵێم کە کەس پێش مـن نـەیکردبێ، هـەر لەو شوێنەدا منداڵێکی تازە پێگەیشتوو لێـی ڕادەپـەڕێ و دەڵێـت: ئەگـەر ڕاسـت دەکـەیت پیتێکی تازەم پێ بڵێ جگە لەو (٢٨) پیتەی کە ڕۆژانە بەکاری دەهێنیت لە قـسەکانماندا، ئیتر (أبو العلاء المعری) هیچی بۆ نەمایەوە و بێدەنگ بوو.

# سەرگوزەشتەی پە نجاو دوو

# خوای گەورە ڕۆزی دەرە

دەگێڕنەوە (حاتـەمی کـوری ئەصـەم) لـەلای منداڵـەکان وتـی: دەمـەوێ بـچم بـۆ حـەج منداڵەکان گریان و وتیان: ئەی کێ بەخێومان بکات کچێکی بچوکی هەبوو وتی: لێی گـەڕێن با بڕوات خۆ ئەو ڕۆزی دەری ئێمە نیە، پاشان کە باوکیان ڕۆیشت منداڵەکان بـە برسـیەتی هەمویان سەرزەنشتی ئەو کچەیان دەکرد، کچەکە وتی: خوایە دڵم نەشکێنی، تا ڕۆژێکیان گەورەی وڵات لەلایماڵیاندا تێپەڕی بە هاوەڵـەکانی وت: کـە هەنـدێ ئـاوی خواردنـەم بـۆ بهێنن منداڵەکانی حاتەم گۆزەیەك ئاویان بۆ هێنا کاتێك پاشا خواردیەوەو وتی: ئەمە مـاڵی کێیە؟ وتیان: ماڵی (حاتەمی کوری ئەصـەم)ە، پارچـەیەك ئـاڵتونی خـستە نـاو گۆزەکـەو وتی: هەر کەس منی خۆش بوێت با وەکـو مـن بکـات ئـەو سـەربازانەی کـە لەگـەڵی بـوون هەریەکەیان پارچەیەکیان خستە ناو گۆزەکەوە، ئیتر کچەکە دەستی کرد بە گریان دایکـی وتــی: خــوا کــە رزق و ڕۆزی بــۆ فــرەوان کــردووین بــۆ دەگــری؟ کــچەکە وتــی: ئــا ئەمــە بەندەیەکی خوا ڕووی تێکردین و ئاوا دەوڵەمەند بـوین، جـا ئـەبێ چـۆن بێـت ئەگـەر خـوا ڕومان تێبکات و سەیرمان بکات.

# سەرگوزەشتەی پەنجاو سێ[٧]

# گەڕان بەدوای زانستدا

پێشەوا ئەحمەد (ڕەزای خوای لێ بێ) هەر لە منداڵیەوە ئارەزووی لە وەرگرتنی زانست کردوە، و لەژێر دەستی مامۆستاکان و زاناکان پەروەردە بووە، و زۆر دایکی خۆش ویستوە، تەنانەت دەڵێ: جارێکیان لە کوفە ڕۆیشتمە دەرەوە تووشی سەر ئێشە بووم گەڕامەوە بۆ لای دایکم چونکە مۆڵەتم لێ وەرنەگرتبوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە منداڵیەوە گومانی ئەوەی هەبوو کە هۆی سەر ئێشەکەی ئەوە بووە کە بەبێ پرسی دایکی لە ماڵ دەرچووە، زۆر جار دایکی بەزەیی پێدا دەهاتەوە کە چەند ماندوو دەبێت، بۆیە جاری وابوو جلوبەرگەکەی لێ دەشاردەوە، چونکە پێشەوا (ئەحمەد) هەر لە منداڵیەوە بەردەوام پێش شەبەق دەڕۆیشتە دەرەوە بۆ وەرگرتنی زانست، و جاری وابوو هێندە زوو دەچوو بۆ وەرگرتنی زانست تەنانەت دایکی دەیفەرموو: کوڕم جارێ با لەخەو هەستن[١].

---

١ الحديپ والمحدپون: (٣٥١)، ابن حنبل: (٢٠)، المناقب: (٢٠)، الأئمه الأربعه: (٢٣)، البديه والنهايه: (١٠/٢٧٣)، سير أعلام النبلاو: (٧/٤٦١).

# سەرگوزەشتەی پەنجاو چوار

# ستەم کردن

دەگێڕنـەوە: ئـەنو شـێروان، ڕۆژێـك دەچـێتە ڕاو و بـەدوای نێـچیرێك دەکـەوێت و لـە لەشکرەکەی دادەبڕێـت، زۆر مانـدو و هـیلاك و تێنـوو دەبێـت، ڕێگـای دەکەوێتـە بـەردەم باخێك، و مێرد منداڵێك دەبینێت و پێی دەڵێ: هەنارێکم بدەرێ ئـەویش دەیداتـێ، و ئـەنو شێروان دەیکاتە دوو پارچەو دەنکەکانی دەکوشـێت و ئـاوێکی زۆری لـێ پەیدا دەبێـت و دەیخواتــەوە و ســەری ســوڕ دەمــێنێ لــەم هــەنارە، لــەولا بڕیــار دەدات ئــەم باخــە لــە خاوەنەکەی زەوت بکات!، پاشان بە منداڵەکە دەڵێ: هەنارێکی ترم بدەرێ؟! کە پێـی داو شەقی کرد سەیری کرد ئاوێکی کەمی هەیەو تامی زۆر ناخۆشـە! بـە منداڵەکـەی وت: ئـەی منداڵ ئەوە بۆ ئەم هەنارە بەم جۆرەیە؟! منداڵەکە وتی: وادیارە پادشای ئەم وڵاتـە نیـازی ستـەمی هەیـە، بۆیـە ئـەم هـەنارە وای لێهـات، (منداڵەکـەش نەیـدەزانی ئەمـەی بـەردەمی پادشـای وڵاتـە) یەکسەر ئـەنو شـێروان پەشـیمان بویـەوە لـە نیازەکـەی، پاشـان داوای هەنارێکی تری کرد، کە کردیە دوو پارچە وەکو جاری یەکـەم ئـاوی زۆرو تـامێکی خۆشـی هەبوو، بە منداڵەکەی وت: ئەوە بۆ دووبارە گەڕایەوە دۆخی جارانی؟ منداڵەکە وتی: وادیارە پادشای وڵات پەشیمان بۆتەوە لە ستەمکردن!

پێـشەوا (ڕازی) دەڵـێ: لەبـەر ئـەم دادپەروەریـەی ئـەنۆ شـێروان نـاوی تـا ئێـستاش ماوەتەوە بەپادشای دادپەروەر.

# سەرگوزەشتەی پەنجاو پێنج

# جورەیج و ( منداڵێکی ساوا )

پێغەمبەری خوا(ﷺ)سەرگوزەشتەی گەنجێکی خواناسی کۆمەڵی ئیماندارمان بۆ دەگێڕێتەوە تا پەروەردەو پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرین، و ببێتە چرایەك لەسەر ڕێگای بانگخوازانی ئایینی ئیسلام.

دیارە پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکەم مامۆستای مرۆڤایەتیە، بۆیە ئێمەش پێویستە زۆر بەرێزەوە لە بەردەم فەرمایشتەکانیدا چۆك بدەین، و بە شێوەی قوتابیەکی گوێڕایەڵ وەریان بگرین و لێیان تێبگەین، و بە پێی توانا لێیان بکۆڵینەوە، تا لەبەر ڕۆشنایی ئەو فەرمایشتانەدا بەرەوە ڕەزامەندی پەروەردگار هەنگاو بنێین.

بەنی ئیسرائیلیەکان بەناو هەڵگری دینی خوا بوون، بەڵام لە ڕاستیدا دووری و لادانێکی بێ ئەندازە لە دین ژیانی لێ تاڵ کردبوون، بۆیە ئەوانەی بیانویستایە خواپەرستی بکەن ناچار دەبوون گۆشەگیری بکەن، تا بتوانن پەروەردەی دڵ و دەرونیان بکەن.

یەکێ لەو خواناسانە لاوێکی هەست پاك بوو ناوی جورەیج بوو.. جورەیج هەر بە گەنجی ڕووی کردبووە خواپەرستی تا ڕەزامەندی خوا بە دەست بهێنێ.

بەندەی خواناس بڕیاریدا لە شوێنێکی تایبەتیدا دەست بکاتە خوا پەرستی تا زیاتر دڵی پەیوەست بێ بە خواوە، لە کەس و کارو خۆشەویستانی دوورکەوتەوە، ڕووی لە نوێژو خواپەرستی کرد، تام و لەزەتی بەندایەتی وەها چووبۆوە دڵیەوە، بە هیچ شێوەیەك لێی بێزار نەدەبوو.

چونکە ئەوانەی خواناسی بگرنە بەر پێویستە خۆشەویستی دونیا لە دڵیاندا کەم بکەنەوە، تا بتوانن خۆیان لە ژەنگ و ژاری نەفامی ڕزگار بکەن، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) پێش ئەوەی وەحی بۆ بێت لە ئەشکەوتی حیرائدا ماوەیەك گۆشەنشینی کرد، ئەو شوێنەی جورەیج خواپەرستی تێدا دەکرد.

ڕۆژێکیان بێ تاقەتیەك بەسەر دایکیدا هات و بڕیاڕیدا سەردانی کوڕە خۆشەویستەکەی بکات، دایکە هات گەیشتە جورەیج دەبینێ کوڕەکەی وا نوێژ دەکات، ئەمجا دایکی بـانگی کردو وتی: جورەیج!

جورەیج بیری کردەوە ئەمە دایکیەتی و سۆزو خۆشەویستی هـەڵی پێچاوەو هاتووەتـە لای، لاوی موسڵمان خۆشەویستی دایکی لە دڵیا جووڵـاو ویـستی وەڵامـی بداتـەوە، بـەڵام خێرا بیری کردەوە ئەم وا لە بەردەم پەروەردگاردا نوێژ دەکات، و وتووێژی لەگەڵدا دەکا، ئەویش گوێی بۆ گرتوە، پەروەردگاری هەموو جیهان چاوی لە ملکەچی گەنجی خواناسـە، بۆیە جار لـە دوای جـار بـە تیـشکی بـاوەڕ دڵـی ڕۆشـەن دەکردەوە، ئـای چـەند بـەتام و لەزەتە، بۆیە وتی: ئەی پەروەردگارم دایکم لە لایەکەوە چاوەڕوانم دەکـات و نوێژەکەشـم لەلایەکەوە.

دواجار بڕیاریدا کە وەڵامی دایکی نەداتەوە با سـەر گـەرمی خـوا پەرستیەکەی بێـت و لەوخۆشی و شادمانیە بێبەش نەبێت، کە خۆشی شادمانی ژیان لەگـەڵ کـەس و کـاردا لـە چاویدا هیچ نیە، هەرچەندە دڵی لێدەدا بـۆ چاوپێکەوتنی دایکـی، بـەڵام دەسـت بـەرداری نوێژەکەی نەبوو، بە پـێی خواپەرستی ئەو ڕۆژە لە جـۆرە نوێژێکدا بووبـێ نـەیتوانی بـێ دەستی لـێ هەڵگرێ، و دایکیشی ئەوەندە نەوەستابێ تا لە نوێژکەی بێتەوە، ئەگینا دیارە ئەمیش حەزی کردوە دایکـی ببینـێ، و یـەکێ ئەوەنـدە خوانـاس بـێ، ناشـێ دڵـی دایکـی بڕەنجێنێ مەگەر بۆ فەرمانی خوا.

ناچار دایکی گەڕایەوەو وازی لە کوڕە جگەر گۆشـەکەی هێنـا تـا خواپەرستیەکەی لـێ تێك نەدات، لە ڕاستیدا هەموو دایکێك ئاواتی ئەوەیـە ڕۆڵـەی جگـەر گۆشـەی بـە دڵـی بـێ خەم ببینێ.

بۆ ڕۆژی دووەم هاتەوە بۆ لای دیسان وەکو ڕۆژی یەکەم بە دەسـتی خـاڵی گەڕایـەوە، بۆ ڕۆژی سێهەمیش هاتەوە، بەڵام بێ هودە بوو، گـەنجی خوانـاس نـەی دەتـوانی دەسـت لەو خۆشی و کامەرانیە هەڵگرێ کە لە نوێژەکەیدا دەستی دەکەوت، بۆیـە وەڵامـی دایکـی نەدایەوە، لەئەنجامدا دایکی توڕەبوو، و نزای لە کورەکەی کـردو وتـی: خوایـە نـەیمرێنیت هەتا سەیری دەم و چاوی ئافرەتی داوێـن پـیس بکـات، ئـەم نزایـەی لـە کوڕەکـەی کـردو گەڕایەوە ماڵەوە.

دایکەکە نەیدەزانی گەنجی موسڵمان لـە چ تـام و چـێژێکی بـاوەڕدا دەژی، نەیـدەزانی چەند بە کوڵ حەز دەکا دایکی ببینێ، کەچی ماوەی نیەو ناتوانێ لەو کاتەدا سەری لێبـدا چونکە لە نوێژ بوو، بۆیە وای زانی کوڕەکەی پشتی لێ هـەڵکردوەو گـوێی نـاداتــێ، وا ئـەو نزایەی لێکرد...

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) فەرمانمان پێدەدا کە نزای خراپ لە خۆمان و منداڵ و سامانمان نەکەین، نەوەکو لەو ساتەدا بێ کە خوای گەورە نزاو پاڕانەوەی تیا وەربگرێ.

جورەیج لەسەر خواپەرستی خۆی هەر بەردەوام و سەر گـەرم بـوو، بـە ڕادەیـەك لـەناو بەنی ئیسرائیلیەکاندا ناوبانگی دەرکردبوو، هەموو کەسێ باسی دەکرد.

جارێکیان کۆمەڵێکیان باسـی خواناسـی جورەیجیـان دەکـرد، لـە نێوانیـان ئـافرەتێکی داوێن پیسی زۆر جوانی تێدابوو، وتـی: ئەگـەر بتانـەوێ بۆتـان لـە خـشتە دەبـەم و هـەڵی دەگەڕێنمەوە.

هەموو موسڵمانێ هەر دەبێ تاقی بکرێتەوە، بەڵام هەر کەسەو بـە پـێی توانـای خـۆی تاقی دەکاتەوە، جورەیجی خواناسیش لەم بوارەو بەم تەوژمە بەتینـە تـاقی دەکرێتـەوە، بەڵام دەرچوون و تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندن بە قـوڕس و سـوکی نیـە، بـەڵکو بـە نیـازی پـاکو ڕاسـتە، ئـافرەتی خوانـەناس کەوتـە تـەگبیرکردن بـۆ فریـودانی و هەڵخلیـسکاندنی گەنجی خواناس، لە شوێنی هات و چۆیا ڕێی پێ دەگرت، خۆی بە جوانی دەڕازاندەوە، بە شێوەیەك کە دڵانی حەیران دەکرد، جورەیجیش ئەیدا بـەلایا، ئافرەتەکـە بـە تـەمابوو بـە یەك چاو پێکەوتن شەیدای ببێ و شوێنی بکەوێ، بەڵام ئەم ئاوڕی لێنەدەدایـەوەو بـەڵێنی بە خوای پەروەردگار داوە، لەم جۆرە هەڵوێستانەدا مرۆڤ ئەگەر کۆمـەکی خـوای گـەورەی نەگاتێ زوو تیا دەچێ، هەر بەندەیەك بەراستی ڕوو لە خوا بکات و خـوای گـەورە دەگاتـە فریای..!

ئەو ئافرەتە زۆر داخی لە دڵدا بـوو، چـونکە لاوی خوانـاس ئـاوڕی لێنەداوەتـەوە هـەر پیاوێ چاوی پێ کەوتبێ یەکسەر شەیدای بووەو ئاواتە خوازبوو ئـەو ژنـە سـەیرێکی بکـا،

کەچی ئێستا شەڕ بەم گەنجە دەگێڕێ و وەڵامـی نیـە، ئافرەتەکـەش لـە داخـان بڕیاریـدا تۆڵەی لێ بکاتەوە، لەبەر خۆیەوە بە تەمای سەرکەوتن بوو، کەچی وا لە یەکەم هـەنگاودا دۆڕاندی.

ئەمجا ئافرەتەکە هاتـە سـەر ئـەو بڕیـارە وا هـەر چـۆنێ بـۆی بکـرێ گـەنجی خوانـاس بشکێنێ، بەڵام نەیتوانی پاش هەوڵدانێکی زۆر....

ئافرەتی خوانەناس خۆی گەیاندە لای شوانێك کە هات و چۆی لای جورەیجی دەکـردو لەوێ دەمایەوە، خۆی گەیانـدە لای و بـە قـسەی لـوس ترسـی خـواو ڕۆژی دوایـی لـە بـیر بردەوەو کاری حەڕامی لەبەر چاویا سووك و ئاسان کرد، ئەمجا لەگەڵیا ڕێکـەوت، شـەرمی پەروەردگاری جیهان لە دڵیا نەبوو، ئافرەتی زۆر زانـیش مۆڵـەتی نـەداو ئەوەنـدە لەگـەڵیا مایەوە تا زینای پێ کردو سکی پڕ بوو، دیارە شوانەکە ئەگەرچـی ماوەیـەك هـات و چـۆی گەنجی موسڵمانی کردبێ، ئەوەندە ترسی خوای لە دڵدا دروست نەبوو تابتوانێ خـۆی لـەو کارە حەڕامە بپارێزێ، لە پاشان ئەو ئافرەتە منداڵەکەی بوو، دیارە ئەو کۆمەڵە هـەر چـۆن بێ شتێك لەدین و ڕەوشتیان تیابوو، بۆیە کەوتنە لۆمەی ئافرەتی داوێن پـیس ئەمـەت لـە کوێ بوو؟ ئافرەت بەبێ مێرد کە منالّی بوو ئەبێ باوکەکـەی دیـاری بکـات.. ئـافرەتی بـێ ویژدان ئەوەندە بێـشەرم بـوو، ئـەم ئابڕوچـوونەی کـردە هـەڵ کردیـە ڕۆژی سـەرکەوتن و تۆڵەسەندن، بڕیاریدا شـەرەف و ئـابڕووی جـورەیجی خوانـاس بـشکێنێ، بۆیـە وتـی: هـی جورەیجە!

موسڵمان ئەگەر ئەم هەڵوێستە بۆ خۆی بێنێتە بەر چاو چۆن خوێنی ناوەستێ؟

ئەوەی موسڵمان پێی موسڵمانە شانازی پێوە دەکاو ڕێزی پێ وەردەگرێت شـەرەف و داوێن پاکیە.

جورەیجی خوا پەرستیش ئاگای لە نیازی ئافرەتی پیسی بەدکردار نیە کە ئەمـە چـەند مانگێکە بۆ هەلْ دەگەرێ تا ئابڕووی بەرێت، و ئاگاشی لێ نیە چۆن زۆڵی ناوەتە مل، ئـەو هەر خەریکی ڕازیکردنی خوایە بڕیاری داوە خوا لەخۆی ڕازی بکات.

ئافرەتەکە گەیشتە دادگای پاشا تا سزاو تۆڵەی خۆی لە (جورەیج) بکاتەوە.

ئافرەت لە بەردەم پادشادا ئامادەبوو، پادشا پرسی: ئەم منالّە هی کێیە؟

ئافرەتەکەش بەبێ دوو دلّی وتی: هی جورەیجە.

پادشا وتی: ئەوەی کە لە پەرستگاکەدا خوا پەرستی دەکات؟

ئافرەتەکـە وتـی: بـەڵێ، پادشـا زۆر نارەحـەت و پەسـت بـوو، کـابرا خواپەرسـتی و پیاوچـاکی دنیـای پڕکـردووە، و ئـەم ڕەفتـارە ناشـیرنەی لێـوە دەرکـەوت، پادشـا چـەند پیاوێکی ناردو فەرمانیدا بەسەریاندا کەوا پەرستگاکەی بـڕوخێنن و بـە دەسـت بەسـتراوی بیهێنـە بـەردەمی، کـاتێ پیاوەکـان گەیـشتنە لای جـورەیج نوێـژیان پـێ بـڕی، و دەریـان هێنایە دەرەوەو بە پاچ و زەنگن بەربوونە پەرستگا هەتا بە تەواوی ڕووخاندیان.

جورەیج بێ خەبەرەو نازانێ ئەمانە بۆچی ئاوای پـێ دەکـەن، ئـەوانیش بـەبێ بـەزەیی هەردوو دەستیان بە گوریس توند بەست بە ملیەوە، پاشـان بـە لێدان و قـسە پـێ وتـن و توانج تێگرتن دایانە بەر هەرکەسێ بە چاویەوە بوایە بە کولْ بۆی دەگریاو دەی پرسی؟

ئەم هەژارە چی کردووە؟

تۆ بلّێی لەسەر خواناسی وای پێ بکەن؟

نالّێن: خوا پەرستی دەکات بۆیە لێی دەدەن.

نالّێن ڕێبازی خوای خۆش دەوێت.

نالّێن: دان بە ڕێبازی نەفامیدا نانێت.

بەو حالّەوە بەبێ ڕێزی دایانە بەر لە ڕێگادا تێپەڕیان پێ کرد بە لای کۆمـەڵێ ئـافرەتی داوێـن پیـسدا چـاوی پێیـان کـەوت، زەردەخەنەیـەکی کـردو ئـەوانیش وەکـو خەڵکەکـە سەیریان دەکرد.

دوای ئەوە گەیاندیانـە لای پادشـاو ئـەویش پرسـیاری لێکـردن و وتـی: ئـەوە چـیتانە؟ چیتان دەوێ لێم؟ من چیم کردووە؟

وتیان: بۆچی لەگەڵ ئەو ئافرەتە داوێـن پیـسەدا زینـات کـردووەو کـوڕێکی لێـت بـووە جورەیجیش وەك موسڵمانێکی بـاوەڕ پتـەو بـەبێ تێکـچوون پرسـی: کـوا منالّەکـە؟ داوای منالّی کرد ئەوانیش بۆیان هێنا، کە چاوی پێ کەوت هیچ متمانەو باوەڕی بە پەروەردگاری نەگۆڕا بۆیە وتی: دە وازم لێبینن تا نوێژ بکەم، بەڵێ دەستی بە نوێژ کرد تا پەیوەندی بە خواوە بکـات، پـاش ئـەوەی کـە نوێـژی تـەواو کـرد، دڵـی گەشـایەوە دوور لـە مەینـەت و خەفەت، ئەمجا ڕووی کردە منالّە تازە لە دایك بووەکەو (بە نووکی پەنجە) دای لە سکی و پێی وت: ئەی کوڕەکە، کێ باوکتە؟

هەر کە جورەیج پرسیاری کرد منالّی ساوا بەفەرمانی پـەروەردگار هاتـە وەڵام و وتـی: فلان کەسی شوان.

پادشا سەری سوڕما.. خەڵکەکە هەموویان بەجارێك واقیان وڕمـا بـوو، دیـارە جـورەیج بێتاوانە.

ئەمجا خەڵکەکە بە چاوی خۆیان، بۆیان دەرکەوت ڕێگـای گـەنجی خوانـاس ڕێگایـەکی ڕاستە، بۆیە بە جارێك هەڵمەتیاندا ماچیان کرد، داوای چاو پۆشی و بەخشینیان لێ کرد.

هەر چۆن بێ لە قولاّیی دڵیانا سەلما کەوا جورەیج بێ تاوانەو ئەو ئافرەتەش بوختـانی بۆ کرد، بەم شێوەیە جورەیج وانەیەکی ڕێکوپێکی خواناسـی پێـشکەشی پادشـاو کۆمـەڵ کرد، تا بە چاوی خۆیان نـاو نیـشانی بەنـدەی ڕاسـتەقینەی خـواو بەرهـەمی خواپەرسـتی ڕاستەقینە ببینن، بۆیە پادشاو پیاوانی دەوروبەری ڕێزێکی زۆریان بۆ جورەیج دانـا، دوای ئەوەی پەشیمانی هەڵوێستی نەشیاویان بەرامبەری دەربڕی، بۆیە بڕیاریاندا پەرستگاکەی بەچاکترین شێوە بۆ دروست بکەنەوە.

لێیان پرسی: ئایا ماوەمان دەدەیت پەرستگاکەت لە زێڕ بۆ دروست بکەینەوە؟

وتی: نەخێر.

وتیان: ئەی لە چی بۆت دروست بکەینەوە؟

وتی: وەك جاران لـە قـورِ دروسـتی بکەنـەوە، ئـەوانیش بـە گوێیـان کـردو بۆیـان چـاك کردەوە.

پادشا پرسیاری لێکرد ئەی ئەو زەردەخەنەیە چی بوو لە ڕێگادا کردت؟

وتی: کارێکم بیرکەوتەوە، کە خۆم چاك دەمزانی نزاکەی دایکم لێم گیرا بوو، کاتێ سـێ ڕۆژ لەسەر یەك هات بۆ لام و وەڵامم نەدایەوە، تا لێم زویر بوو، ئەوە بوو نزای لێکردم خوا نەمکوژێ هەتا سەیری دەم و چاوی ئافرەتی بە ئاشکرا داوێن پـیس بکـەم، جـا کـە چـاوم پێ کەوتن زەردەخەنەی ئەوەم کرد کەوا نزاکەی گیرا بووە.

دوای ئەوە پادشا فەرمانیدا بەڕێزەوە ڕەوانە بکرێتەوە بۆ شوێنی خـۆی، دوای ئـەوەی پاکی و ڕەوشت بەرزی بۆ هەموو کەس دەرکەوت [1].

---

١ـ رواه البخاري برقم (٣/١٧٠) مع شرحه فتح الباري (٥/١٢٦–١٢٧)، ومـسلم (٨/٤–٥)، والبخـاري في الأدب المفرد (١٩–٢٠): وأورده الإمام النووي في رياض الصالحين بـرقم (٢٥٨)، وابـن كـثير في البدايـة والنهاية (٢/١٣٤–١٣٦).

# سەرگوزەشتەی پەنجاو شەش

# چاکە لەگەڵ دایك و باوکدا

ئێواریەکیان دایکە لەگەڵ منداڵەکانیدا دانیشت، و یارمەتی دەدان لە پیاچونەوەی وانەکانیان، ئەو منداڵەی کە تەمەنی (٤) ساڵ بوو، دەفتەری وێنە کێشانەکەیدا بەدەستیەوە، تاوەکو سەرقاڵی نەکات و بتوانێت وانەکانی بلێتەوە.

لە پڕ بیری کەوتەوە کە خواردنی ئێوارەی ئامادە نەکردوە بۆ باوکە بە ساڵاچوەکەی مێردی کە لەگەڵیاندا دەژیا لە ژورێکدا، و لە گۆشەیەکی ماڵەکەیاندا، چەند لە توانایدا هەبوو هەڵدەستا بە خزمەتکردنی، مێردەکەشی ڕازی بوو لە خزمەتکردنی ئەو بۆ باوکی، چونکە باوکی بەهۆی نەساغیەوە لە ژورەکەی نەدەهاتە دەرەوە، بە پەلە خواردنی بۆ بردو لێی پرسی: ئایا پێویستیت بەهیچ شتێکی تر نیە، و پاشان ڕۆشتە دەرەوە، کاتێ گەڕایەوە بۆ لای منداڵەکانی، هەستی کرد کە منداڵە بچوکەکەی خەریکی وێنە کێشانی بازنەو چوارگۆشەو دانانی ئاماژەیە لێی پرسی: ئازیزم ئەوە وێنەی چی دەکێشیت؟

منداڵەکەش بەو پەڕی ئازایەتیەوە وتی: من وێنەی ئەو ماڵە دەکێشم کە کاتێك گەورە دەبم و ژن دەهێنم و تیایدا دەژیم، وەڵامدانەوەکەی دڵخۆشی کرد.. وتی: ئەی لە کوێ دەخەویت؟ منداڵەکەش چەندین چوار گۆشەی پێنیشاندا، و دەیوت: ئەمە ژوری نوستن و ئەویان مەتبەخ و ئەوی تریان ژوری میوان و.. هتد، بۆیە دەستی کرد بە ژماردنی هەموو ئەوانەی کە دەیزانی لە ماڵەکەدا، پاشان چوار گۆشەیەکی لە دەرەوەی چوارچێوەکە کێشابوو.

دایکیشی سەرسام بوو پێی وت: بۆچی ئەو ژورە لە دەرەوەی ماڵەکە دایە، و جیایە لە هەموو ژورەکانی تر؟ لە وەڵامدا منداڵەکە وتی: ئەوە ژوری تۆیە، تۆ دەخەمە ئەوێ و لەوێدا بژیت، وەکو چۆن باپیرە گەورەم لەوێدا دەژی.

دایکی بە بیستنی قسەی منداڵەکەی توشی شۆك بوو! ! بۆیـە لـە خـۆی دەپرسـی ئایا دەبێت من بەتەنها لەو چۆڵەوانیەدا لە دەرەوەی ماڵەوە دابم، بەبێ ئـەوەی خۆشـی ببیـنم لە قسەکردن لەگەڵ کوڕەکەم و منداڵەکانیدا، و دڵخۆش ببم بە قسەکانیان کاتێ لـە جولـە دەکەوم؟ ئەو کاتە قسە لەگەڵ کێدا بکەم؟ ئایا هەموو تەمەنم لە نێو ئـەم چـوار دیـوارەدا بەسەر بەرم، بەبێ ئەوەی گوێم لە دەنگی ئەندامانی خێزانەکەم بێت.

بە پەلە کارگوزارەکانم بانگ کردو بەخێرایی ژوری تایبەت بە میوانمـان گواسـتەوە، کـە ڕازاوەترین ژوور بوو، کەلوپەلی مامم (باوکی مێردەکەم) ئامادە کـردو کەلوپـەلی تایبـەتی ژوری میاوانیشم گواستەوە بۆ ئەو ژورەی دوور بوو لە خانوەکە.

کاتێ مێردەکەی گەڕایەوە لە دەرەوە سەرسام بوو بەو کارە، چونکە چاوەڕوان نـەکراو بوو.. لە خێزانەکەی پرسی: چی وای لێکردیت ئەو گۆڕانکاریە بکەیت؟

بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە وتی: مـن جـوانترینی ژورەکـان هەڵدەبـژێرم مـن و تـۆ تیـادا بژین، ئەگەر خوای گەورە تەمەنی پێداین و لە جموجۆڵ کەوتین، با میاوانەکان لەم ژورەی دەرەوە بن.

مێردەکەشی لە مەبەستەکەی تێگەیشت، و ستایشی ئەو کـارەی کـرد کـە بەرامبـەر بـە باوکی ئەنجامی دابوو، کە ئـەویش بـە ڕوخـساری پـڕ لـە خەنـدەوە تەماشـای دەکـردن، و منداڵەکەش تەنها ئەوەی بۆ مایەوە وێنەکەی ڕەشکردەوەو خەندە گرتی.

# سەرگوزەشتەی پەنجاو حەوت

# نازانم گوێڕایەڵی کێ بکەم

کچە بچوکەکە لە قوتابخانە گەڕایەوە، دوای ئەوەی گەشتەوە ماڵ دایکی هەستی کرد بێتاقەتە، بۆیە پێی وت: کچەکەم بۆچی بێتاقەتی؟

کچەکەش وتی: دایە گیان! مامۆستاکەم هەڕەشەی دەرکردنی لێکردم لە قوتابخانە بەهۆی ئەو جلە درێژانەوە کە لەبەرمدایە!!

دایکی وتی: کچی شیرینم ئەو پۆشاکەی لەبەرت دایە خوای گەورە داوای دەکات.

وتی: بەڵێ دایە گیان! بەڵام مامۆستاکەمان ئەوەی ناوێت!

دایکی وتی: کچی خۆم! مامۆستاکە ئەوەی ناوێت، بەڵام خوای گەورە ئەوەی دەوێت، تۆ گوێڕایەڵی کێ دەکەیت؟ ئایا گوێڕایەڵی ئەو خوایە دەکەیت کە تۆی بەدیهێناوە، و بەجوانترین شێواز دروستی کردوویت؟ یان گوێڕایەڵی دروستکراوێ دەکەیت کە ناتوانێ سوود بەخۆی بگەیەنێت.

کچەکەش وتی: بەڵکو گوێڕایەڵی خوای گەورە دەکەم.

دایکی وتی: خوا لێت ڕازی بێت بۆ ژیریت، و دەستت خۆش بێت.

بۆ ڕۆژی دوایی کچەکە بە پۆشاکە درێژەکەیەوە ڕۆشتە قوتابخانە.. کاتێ مامۆستاکەی بینی زۆر بەتوندی سەرزەنشتی کرد، کچە بچوکەکەش نەیتوانی بەرگەی ئەو سەرزەنەشتە بگرێت، بۆیە دەستی کرد بە گریان، پاشان ئەو کچە بچووکە وتانێکی ئاراستە کرد، کە لەمانادا زۆر گەورەبوون، و وتەکان کەم بوون.. وتی: بەخوا نازانم گوێڕایەڵی کێ بکەم؟ تۆ یان..

مامۆستاکەش وتی: یانی چی؟

کچەکە وتی: خوای گەورە، ئایا گوێڕایەڵی تۆ بکەم، و چیت دەوێت لەبەری بکەم و سەرپێچی خوای گەورە بکەم، یان گوێڕایەڵی ئەو بکەم و سەرپێچی تۆ بکەم.. من گوێڕایەڵی خوای گەورە دەکەم و چی دەبێت بابێت.

ئای کە چەندە وتانێکی جوان بوون.. لەو زارە بچکۆڵەوە هاتـەدەرو وتانێـك لایـەنگریی تەواوی خۆیی نیشاندا بۆ خوای گەورە.

ئەو منداڵە بچوکە جـەختی لەسـەر پابەنـدبوون، و گوێڕایـەڵی دەکـرد بـۆ فەرمانـەکانی خوای گەورە.

ئایا مامۆستاکە لە ئاستیدا بێدەنگ بوو؟

مامۆستاکە داوایکرد کە دایکی قوتابیەکە بانگ بکرێت.. دەبێت چی بووێت لە دایکـی.. دایکی هات.

مامۆستاکە بە دایکی وت: بەڕاستی کچەکەت مەزنترین ئامۆژگاری منی کرد کە تا ئێستا بیستبێتم لە ژیانمدا.

بەڵێ.. مامۆستاکە پەندی لەم منداڵە بچوکە وەرگـرت، و ئـەو مامۆسـتایە پـەروەردەی خوێنـدوەو زانـستی وەرگرتـووە، زانـستەکەی ڕێگـای لێنـەگرت.. پەنـدو ئامۆژگـاری لـە منداڵێکمی بچوکەوە وەربگرێت کە لەتەمەنی کچێکە لە کچە بچکۆڵانەکەی خۆی.

سڵاو لەو مامۆستایە.. سڵاو لەو کچە بچکۆڵەیە کە پەرەوەردەی ئیـسلامی وەرگرتبـوو، پابەند بوو پێوەی.. سڵاو لەو دایکەی کە خۆشەویستی خـوا پێغەمبەرەکـەی چاندووە لـە دڵـی کـچەکەیدا.. ئـەو دایکـەی کـە کـچەکەی فێـری خۆشەویـستی خـواو پێغەمبەرەکـەی کردووە.

ئەی دایکـانی موسـڵمان، منداڵـەکانتان وەکـو هـەویر وان، و لـەنێو دەسـتی ئێـوەدان و دەتوانن هەموو شتێ دروست بکەن لێیان، و بەو شێوەیە بیانپارێزن کـە ڕەزامەنـدی خـواو پێغەمبەرەکەی تێدایە، فێری نوێژیان بکـەن، فێـری گوێڕایـەڵی خـوای گـەورەیان بکـەن.. ئەگەر بە منداڵی پەروەردە نەکرێن، کاتی گەورەبوون پەشیمان دەبنەوە.

ئـەم کـچە لەسـەردەمی هاوەڵـان نـەژیاوە.. بـەڵکو لـەم سـەردەمەدا ژیـاوە، ئەمـەش نیشانەی ئەوەیە کە ئێمە دەتوانین نمونەی ئەو کچە بێنینـەدی، کـچێکی خوانـاس و بـوێر لەسەر دەرخستنی هەق کە گوێ بەلۆمەی کەس نادات لەبەر خوای گەورە.

# سەرگوزەشتەی پەنجاو هەشت

## ملوانکەکەم لێ مەدزن چونکە هەتیوم

ساڵی (٢٠٠٣)ز سەرەتاکەی ڕۆژیەکی باشی هـەبوو، بـەڵام کۆتاییەکـەی خـەم و خەفـەت دڵمی داگیر کردبوو، ئازاری ویژدان کاریگەریەکی زۆری هەبوو لەسـەر دەرونم، لەبـەر ئـەوە شەو خەوم لێنەدەکەوت، تەنها ساتانێکی کەم نەبێت.

مەبەستیشم ئەوە بوو کە ئەم منداڵە بچکۆڵەیە لە خەودا نەیەت بۆ لام، لەگەڵ ئەوەشدا لۆمەی دەکردم لەسەر تاوان و گوناه دەرهەق بە ئەو ڕۆژێك لـە ڕۆژان، کـاتێکیش لـە خـەو هەڵدەستام نەمدەتوانی خۆم بگرم، و بە حەسرەت و پەشیمانیەوە دەگریام.. لەسەر ئـەو کردەوەیەی کە کردبووم.

من ئافرەتێکم ڕۆژێکیان بانگ هێشت کرام بۆ زەواجی کچێکی هاوڕێم لـە خوێنـدنگادا.. لە ڕۆژ دیاریکراودا ڕۆیشتم، و بیرۆکەی بەدەست خستنی پارە لە بیروهۆشمدا بوو.

کاتێ چومە هۆڵەکەوە ئاڵتونێکی زۆرم بەدی کرد، وەك ئەوەی کـەوتبێت لـە زەویـدا، و پێویـستی بـە کەسـێك هەیـە بیبـات، ئافرەتـانم دەبـینی خۆیـان ڕازاندبویـەوە بـەو کـانزا گرانبەهایەو بڕێکی زۆر لە دەست و ملیاندا بوو، لەو کاتـەدا هەسـتم دەکـرد کـە کـاری مـن ئەوەیە ئەو زێڕانە بەرم.. ئافرەتـەکان سـەرقاڵبوون هـیچ ئاگایـان لـە زێڕەکانیـان، و کـچە بچوکەکانیان نەدەما لە کاتی سـەماکردندا، لـەو کاتـەدا بیرۆکەیـەکم بـە خەیاڵـدا هـات کـە زێڕی ئەم منداڵە بـچکۆڵانە ببـەم، بـەڵام لەمپـەرێکی بـچوك کارەکـەمی وەسـتاند، ئـەویش ئەوەبوو چۆن ئەو کارە ئەنجام بدەم، بەڵام زۆر بەخێرایی خەیاڵێکم بۆ هـات، و بـەخێرایی لە هۆڵەکە ڕامکرد بۆ دەرەوە بۆ لای نزیکترین فرۆشیار..

هەندێك لەو شیرنیانەم کڕی کە مندالانی بچوك حەزیان لێدەکرد، مەبەستی من لەوەدا ڕاوکردن و هەڵنانیان بوو بۆ ئەو خواردنە.. بۆیە بیرۆکەکم سەری گرت، و یەکێکیانم ماچ کردو دڵنیام کە چوار ساڵی تێنەپەڕاندبوو بڕێکی زۆر خشڵ و زێڕی پێوەبوو، منیش دانەویمەوە بۆی و بە قسەکردن سەرقاڵم کرد، و پارچەیەك لە شیرینیەکەم پێدا، و بەو شێوازە توانیم بازنەکان لە دەستە بچوکەکانی دابکەنم و بەخێرایی لە هۆڵەکە هاتمە دەرەوە.. لە کاتی شەودا هەستم بە ئازاری ویژدان دەکرد، هەر چەندە دڵخۆش بووم بەو دەستکەوتە کە ئەو دزیە بچوکە بوو.

لەسەر ئەو بنچینەیەو ئەو سەرکەوتنە، بڕیارمدابوو جارێکی تر کارەکە تاقی بکەمەوە، بەمەرجێ بەچە بکەم بە ڕوخسارمدا هەتا کەس نەمناسێتەوە، و لەگەڵ هامۆشەکەراندا وەك ئەوەی بانگ کرابووم..

بەدرێژایی ساڵێکی تەواو سەرقاڵ بووم و دەچومە هۆڵەکانی ئاهەنگ گێڕانی زەواجەوە، پارەیەکی زۆرم دەست دەکەوت.. تا شەوێکیان چومە یەکێ لە هۆڵەکانەوە دانیشتم بە دوای نێچیرێکدا دەگەڕام، بینیم لە دورەوە مندالێك دانیشتووە، وەك نەیەوێت بەشداری ئاهەنگەکە بکات.

منیش هەنگاوم بۆی ناو بە پەلە چوم بۆ لای و خەندەیەکی درێژم خستە سەر ڕوخسارم بۆی، خواردنیشم بەدەستەوە بوو، کە هەندێ شیرنی بوو مندالان حەزیان لێدەکرد، دانەویمەوە بۆی و پێم وت: کچی جوان ناوت چیە؟ وتی: (شعاع) وت: پۆلی چەندی؟ وتی: چوارەمی سەرەتایی و بەیەکەم دەرچووم، پێم وت: نزیك بەرەوە لێم تا پیرۆزباییت لێ بکەم، ئەنجا شیرنیەکەم دایە دەستی، لەو کاتەدا دەستی ڕاستم درێژ کرد تا پێچ بکاتەوە بەدەوری ملیداو، و ملوانکەکە لێ بکەمەوە، بۆیە خێرا هەستی کردو وتی: ملوانکەکەم مەدزە من هەتیوم، بێجگە لەو کەسی تر بۆی نەکڕیوم، منیش بەهۆی

قسەکانیەوە دەستم کێشایەوە دواوە، دواتـر پـێم وتـی: کچی خـۆم مەترسـە تـەنها حـەز دەکەم ئەو ملوانکەیە ببینم کە خۆتت پێ ڕازاندۆتەوە، تا منیش یەکێك لەو شێوەیە بکڕم بۆ کـچەکەم.. نزیـك بوویـەوە لـێم و بـڕوای پێکـردم و دایکەنـدو دایـە دەسـتم، منـیش بـە خێرایی لە هۆڵەکە هاتمە دەرەوەو بـەخێرایی بـەرەو لای ئۆتۆمبێلەکـەم ڕۆشـتم، گەشـتمە ماڵەوە و کاتێك خۆمدا بەسەر جێگاکەمدا بۆ یەکەمین جار هەسـتم کـرد بـە پەشـیمانی، و هەستم بـە ترسـێکی زۆر کـردو ویـستم بخـەوم، بـەڵام چـەند سـاتێکی نـەبرد تیشکێك لـە خەومدا دەهات بۆم و دەگریـا و دەیـوت: کـوا ملوانکەکـەم بـاوکم زۆری لێـداوم، تەماشـای جەستەم بکە ئەوە ئاسەوای لێدانەکەیەو بە ئاشکرا دیارە، تکات لـێ دەکـەم بمـدەرەوە.. کاتێ خەبەرم بویەوە سەیری لای ڕاست و چەپی خۆمم کرد، چونکە دوور نەبوو ئەو منداڵـە لە ژورەکەمدا بێت.

لەسەر ئەو هەستە ناخۆشەی کـە هـەم بـوو پێـوەی دەتلامـەوە، بۆیـە بڕیارمـدا واز لـە دزیکردن بێنم، بۆ ئەوەی بحەسێمەوە، بەڵام تیشکێك دوای دوو ڕۆژ بۆ جـاری دووەم بـۆم هاتەوە، ئەو قسانەی کرد کە جاری یەکەم کردنی، تەنها لەو ساتانەدا هەستم بە گەورەیی ئەو تاوانە کرد کە من دەیکەم، و بڕیامدا تەوبە بکەم و واز لە دزینی ئاڵتو ن و زێڕیمنـداڵان بهێنم لە ئاهەنگەکاندا.. بەهۆی ئەو کچە بچکۆڵەیەوە کە دەیـوت: ملوانکەکـەم لـێ مـەدزە چونکە هەتیوم بڕیارمدا تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکەم، و بگەڕێمەوە بۆ لای خـوا.. ئـەوەش کاتێك بۆ جاری بۆ یەکەم نوێژم کردو داوای لێبوردنم لەخوای گەورە کرد، ئێستاش لەسەر ئـەو ڕێگایـەم و دەخـوازم بـەردەوام بم لەسـەری تـا خـوای گـەورە ڕۆژێ لـە ڕۆژان گیـانم دەکێشێت، لەگـەڵ تێپـەڕبوونی ماوەیـەکی زۆر بەسـەر دوهـەمین دزیکردنـدا، و دواهـەمین خەوبینین بەو منداڵەوە، بەڵام هێشتا وێنەکەی لەبیرو هۆشمدایـەو لەخـەودا دێـت بـۆم بـە مانگی جارێکیش بێت، لە هەمان کاتدا شوێن نـەماوە نەچم بـۆی، و سۆراخی ئـەو کـچەم

نەکردبێت، بەڵکو (شعاع) لەوێ بێت تا لەنویانـدا ئـەو ملوانکەیـەی بدەمـەوە کـە لـێم دزی بوو.. چونکە هێشتا نەم فەوتاندبوو، لەهەمان کاتیشدا هێشتا ویژدانم لـەو کاتـەوە ئـازارم دەدات، بەهۆی ئەوەوە هێشتا نەحەساومەتەوە یان بە بەختەوەری بژیم[1].

١ ڕۆژنامەی (الهدف) ی کوێتی، ژمارە (١٨٦٧).

# سەرگوزەشتەی پەنجاو نۆ

# جگەر گۆشە

پیاوچاکێك گرفتاری منداڵەکانی ببوو، هەر جارێ منداڵێی دەبوو پێـی دڵخـۆش دەبـوو، بەڵام مەرگ دەیبردەوەو ئەوی بەغەمباری و دڵشکاوی دەهێشتەوە، بەڵام پیاوەکـە لەبـەر پتەوی بڕوای هیچی بەدەست نەبوو، تەنیا دڵی بەخودا خۆش بکـات بـە ئـومێی پاداشـتی، بۆیە هەموو جارێك دەیوت: ((لله ما أعطى ولله ماأخـذ، اللـهم أجرنـي في مـصيبتي واخلفـني خيراً منها)) واتە: ئەوەی خودا داویەتی هی خۆیەتی و ئەوەی دەشیباتەوە هـی خۆیـەتی، خودایە لەو موسیبەتە ڕزگارم بکە، و لەجیاتی ئەو شتی باشترم پێ بدە.

هەروا بەردەوام بوو هەتا منداڵی سـێیەمی، دوای سـێ سـاڵ ئـەویش نـەخۆش کـەوت و نەخۆشیەکەی گرانتربوو، کەوتە سەر لێواری مردن و باوکە داماوەکە لە دیاریدا فرمێـسکی دادەباراند، سەرخەوێك بردیـەوە، لەخەویـدا دیـتی ڕۆژی دوایـی هەسـتاوە، نەهامەتیـەکای ڕۆژی دوایـی دەسـتی پێکـرد، و پـردی (صـيراط) ئامـادە کرابـوو، وا خـەڵك بەسـەریدا تێدەپەڕن، و کابرا خۆشی دیت وا لەسەر (صيراط)ەوە دەیەوێ بڕوات، زۆر ترسـا ڕزگـاری نـەبێت! ئـەمجا دیـتی منداڵەکـەی هـات و پێـی وت: بابـەگیان! مـن یارمـەتیت دەدەم، و دەستی بە ڕۆیشتن کرد، بـەڵام ترسا لـەوەی نـەوەك بەلایەکدا بکـەوێت، لـەوێش منـداڵی دووەمی مـردووی هـات، و دەسـتی گـرت! کـابرا زۆر دڵخـۆش بـوو، پـاش ئـەوەی کـەمێك تێپەڕی و زۆر تێنووی بوو، داوای لە منداڵێکی کرد کە ئـاوی بـداتێ، بـەڵام گـوتی: نـەخێر ئەگەر یەکێکمان بەرت بدەین دەکەویتە ناو ئاگرەوە، چی دەکەی؟ منداڵەکـەی تـری پێـی گوت: بابە گیان! ئەگەر برای سێیەممان هەبایە ئەویش ئێستا بە ئاو فریات دەکەوت!

ئەمجا کابرا بەترس و لەرزەوە لەخەوەکەی خەبـەری بویـەوە، و زۆر سوپاسـی خـوای کرد لەسەر ئەوەی کە ئەو هێشتا لـە دونیایـەو دونیـای لـێ دانـەبڕاوە هێـشتا ڕۆژی دوایـی نـەهاتوە، ئـاوڕی دایـەوە لای کـوڕە نەخۆشـەکەی دیـتی هەناسـەی لـێ بـڕاوەو گیـانی سـپاردووە، هـاواری کـرد سـوپاس بـۆ تـۆ خوایـە گیـان کـە ڕزگـارت کـردم لەسـەر پـردی (صیراط).

# سەرگوزەشتەی شەست

## سەرگوزەشتەی من لەگەڵ مناڵەكەم

لەیەكێ لەبنكەكانی چارەسەركردندا (ب م) ژنی هێنابوو، و حەوت منداڵی هەبوو، ژیانی تلیاك زەلیلی و ریسواییە، سەرەتای رێگای من بۆ جیهانە تاریكە لەرێگای هاورێیەكی خراپەوە بوو، پێشنیاری كرد بۆم تا بەكاری بهێنم چونكە بەپێی قسەی ئەو بەختەوەری دروست دەكات، و بەتەواوی لەشە چالاك دەكات!

منیش رازی بوم خۆزگە رازی نەبومایە، بەهەناسە ساردیەوە ئەمەی وت.. پاشان بەردەوام بوو.. دوای ئەوە رێگام گرتە بەر و هەستم بەخۆم نەدەكرد، چونكە ماددەی بێهۆشكەر وردە وردە كەمەندكێشت دەكەن، تا دەكەویتە داوەكەوە، هیچ ئاگایەكمان لەنوێژكردنیش نەبوو كە پایەی ئاینە.. دەربارەی ژیانم لەگەڵ ژن و منداڵەكانمدا زۆرم دەیا لە ژنەكەم و منداڵەكەم، تەنها لەسەر ئەوەی داوای شتێكیان بكردایە با ئاسانیش بووایە.. لەگەڵ ئەو توندوتیژیەمدا لە مامەڵەكردنم لەگەڵیاندا، مناڵەكان بە تەواوی پێچەوانەی ئەوەبوون، ئەگەر بیانبینیمایە دەهاتنە ئامێزمەوە، بەڵام من هیچ گرنگیەكم پێ نەدەدان.. دێتەوە یادم جارێكیان من لەماڵەوە دانیشتبووم، كچەكەم هات بۆلام كە تەمەنی (٦) ساڵان بوو بەرۆخسارێكی بەرائەتەوە پێی گوتم: باوكە بۆچی ئێمە زۆر كەم تۆ دەبینین؟ پێناكەنیت لەگەڵماندا؟ هەڵدەستا بە جموجوڵی منداڵانە لەگەڵمدا، وەكو چوونە سەر پشتم و لەو جۆرە شتانە، بەڵام من كوێر بووم و وەڵامی ئەو بەرائەتیەم نەدایەوە.. وەڵامی ئەو خۆشەویستیەم نەدەدایەوە.. من دوای مەست بوونم هەستم بە هیچ جۆرە سۆزێك نەدەكرد.. ئەو هەر یاری لەگەڵ دەكردم پاشان وتی: وەكو هاورێكانم لە قوتابخانە یاریەكم بۆ بكرە.. ئیتر ئیتر دونیا لەبەرچاوم تەسك بویەوەو كاتەكەش شەو بوو، هەستامەوە تێمسرەواندو دەستیم گرت، و دەرگاكەم كردەوەو فرێمدایە سەر

شەقامەکەو دەرگاکەم داخستەوە، گوێم لێیەوە بوو دەپاڕایەوە لێم کە ئیتر هەرگیز جارێکی تر داوای هیچ شتێ ناکات.. دوای ئەوەی دایکی هەوڵیدا هێنامە ژوورەوە.. پاشان لەپڕ پیاوەکە بێدەنگ بوو.. وتی: وێنەی بکە و بیهێنە بەرچاوی خۆت لە کچەکەم بدەم و فڕێیدەمە سەر شەقام بەهۆی داواکردنی یاریەکەوە؟

ئەوەیە ئاسەواری ماددە بێهۆشکەرەکان، بەدەنگێکی بەرز وتی: بەڵکو ئەم وتانە بگات بەهەموو تلیاکیەك تا حەقیقەتی کارەکەی لای ڕۆشن بێت.. پاشان وتی: خۆشترینی ڕۆژنامەکانی ژیانم بەدەردەسەری و سەرشۆڕیم بەسەر بردوە.

ڕۆژێکیان چوومە دەرەوە لە ماڵ و زۆر بێتاقەت بووم، یەکێ لە پیاوانی گەڕەکەکەمان لە ئۆتۆمبێلەکەیدا بوو، وەستاو زۆر بەگەرمی سڵاوی لێکردم و پێی وتم: ئیشم پێتە بۆ کارێکی گرنگ.. دوای داکۆکی کردنی سواری ئۆتۆمبێلەکەی بووم، لە شەقامەکانی شاردا دەیگەڕاندم، دەیویست خوا بێنێتەوە یادم، خوای گەورە ویستی وابوو کە ڕێنمایی بکرێم.. وردە وردە قسەکانی پێش ئەوەی بچێتە عەقڵمەوە دەچویە دڵمەوە.. خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە.. دوای ئەوە کۆتایی بە قسەکانی هێنا لەگەڵمدا.. سوپاس بۆ خوا خوای گەورە شیفای پێ بەخشیم، ئێستاش بە عیزەت و کەرامەتەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ خێزانەکەمدا دەکەم، ئەو کچەی کە لێیمدا موژدەت دەدەمێ دوو یاری منداڵانەشم بۆ کڕی[١].

---

١ چجایا الشیگان، یوسف الحاج أحمد.

# سەرگوزەشتەی شەست و یەك

# هیچ تـاوانێکم نەبوو

عومەری کوری خەتاب(ڕەزای خوای لێ بێ) لە کاتێکدا کـە خەلیفـەی موسـڵمانان بـوو بەڕێگەیەکدا دەڕۆیشت، لەو کاتەدا کۆمەڵێك منداڵ لەسەر ڕێگەکەیدا یاریـان دەکـرد، کـاتێ کە پێشەوا عومەری کوری خـەتاب(ڕەزای خـوای لـێ بـێ) بـینی هـەمویان ڕایـانکرد تـەنها (عبدالله ی کوری زوبەیر) نەبێ، عومەری کوری خەتاب(ڕەزای خوای لێ بـێ) زۆری بـەلاوە سەیر بوو لێی پرسی تۆ چۆن ڕات نەکرد؟ (عبدالله ی کوری زوبەیر)یش وتی: هیچ تاوانێکم نەبوو تا بەهۆیەوە ڕابکەم، لێت نەترسام تاکو ڕێگاکەت بۆ فرەوان بکەم[١].

---

١ تربیه الّولاد فی الآسلام، د. عبدالله ناصح علوان، دار السلام.

# سەرگوزەشتەی شەست و دوو

# لە ڕۆژی جەژندا

عومەری کوری عبدالعزیز(ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) لـە ڕۆژی جەژنـدا منـدالێکی خـۆی بـینی جلو بەرگی کۆنی لەبەردا بوو، ئەویش فرمێسك بەچاویدا هاتە خوارەوە، کوڕەکەی بـاوکی بەو شێوەیە دی گوتی: ئەی پێشەوای ئیمانداران بۆ دەگریت؟ گوتی: ڕۆڵە گیان! دەترسم تۆ دڵت بشکیٚ و خەفەت بخـۆی منالـّان بـەم بەرگـە کۆنانـەوە بتبیـنن!! .. گـوتی: ئـەی پێشەوای باوەڕداران دڵی کەسێك دەشکێت ڕەزامەندی خوا لەدەست بدات، ئازاری دایـك و باوکی بدات، بەڵام من داواکارم لە خوای گەورە بەهۆی ڕەزامەندی تۆوە لێم ڕازی بێت[1].

---

١ تربیه الّولاد فی الآسلام، د. عبدالله ناصح علوان، دار السلام.

# سەرگوزەشتەی شەست و سیٚ

# مرۆڤ بەدوو بچوکەیتی

کاتێك عومەری کوری عبدالعزیز(ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) جلەوی خەلیفایەتی گرتـە دەسـت لە هەموو لایەکەوە نوێنەرو شاند دەهاتن بۆ پیرۆزبایی، و خـستنە ڕووی داواکاریـەکانیان، شـاندی حیجازیـەکان هاتنــە خزمــەتی و لــە نێویانــدا منالێـك هاتــە پێـشەوە تەمــەنی نەگەیشتبووە (١١) سالی، عومەری کوری عبدالعزیز(ڕەزای خوای لیٚ بـیٚ) پێـی گـوت: تـۆ بگەڕێرە دواوە با لەتۆ بەتەمەنتر قسە بکات! منالەکەش وتی: ئەی پێـشەوای بـاوەڕداران خوای گەورە سەرکەوتوت بکات، مرۆڤ بەدوو بچوکەکەیەتی: دلـی و زمـانی، ئەگـەر خـوای گەورە زمانێکی پاراوو دلێکی پارێزکاری بە بەندەی بەخشی، ئەو کەسـە شایـستەیە قـسە بکات، ئەی ئەمیری باوەڕداران گەر فەرمان بە پێی تەمەن بوایە ئەوا لەناو ئـەم گەلـەدا لـە تۆ شایـستەتر هـەبوو بکرێتـە خەلیفـە، عومـەری کـوری عبـدالعزیز(ﷺ)یـش وتـەکانی زۆر بەلاوە سەیر بوو، بۆیە ئەم شیعرانەی خوێندەوە:

تعلم فليس المرء يولد عالماً وليس أخو علم آمن هو جاهل

وإنَّ كبير القوم لا علم عنده صغير، إذا التفت عليه المحافل[١]

---

١ تربيه الّولاد فى الآسلام، د. عبدالله ناصح علوان، دار السلام.

# سەرگوزەشتەی شەست و چوار

## تۆ کوڕی کێیت؟

منالێـک لەبـەردەم ئـەمیری بـاوەڕداران خـەلیفـە مەئمونـدا قـسەی دەکـردو بـەجوانترین شێوە وەڵامی خەلیفەی دەدایەوە، مئمـون پێـی گـوت: تـۆ کـوڕی کێـی؟ منالەکـە گـوتی: کوڕی ئەدەب و ڕەوشتم ئەی ئەمیری باوەڕداران، مەئمون گوتی: ئەوە چاکترین نەسـەب و نەژادە، ئەمجا ئەم شیعرانەی خوێندەوە:

كن ابن من شئت واكتسب أدبا يغنيك محموده عن النسب

إن الفتى من يقول: ها أنذا ليس الفتى من يقول: كان أبي[1]

---

١ تربيه الأولاد في الأسلام، د. عبدالله ناصح علوان، دار السلام.

# سەرگوزەشتەی شەست و پێنج

# من پەروەردەی دەوڵەتەکەی تۆم

جارێکیان خەلیفە مەئمون ڕۆیشتە دیوانی پاشایەتی، منالێکی بچوکی بینی قەڵەمێك بە گوێیەوە بوو، مەئمون پێی گوت: تۆ کێی؟ منالەکە گوتی: مـن پـەروەردەی دەوڵەتەکـەی تۆم، لەناو نیعمەتی تۆدا دێم و دەچم و هەڵدەسوڕێم، بـەهیوای خزمـەتی تـۆو حەسـەنی کوری رەجائم، مەئمون سەری سوڕما لە وەڵامەکەی و گوتی: ئەم منالـە زۆر ژیـرە لەپلـەو پایەی خۆی زیاتر بەرزی بکەنەوە[١].

١ تربیه الأولاد فی الأسلام، د. عبدالله ناصح علوان، دار السلام.

# سەرگوزەشتەی شەست و شەش

## ئەم دیوەخانەی من قەدرو ڕێزی نەماوە کێ بیەوێت دێتە ژوورەوە تەنانەت منداڵیش؟

لەسەردەمی هیشامی کوری عبدالملکدا وشکە ساڵی و گرانی بوو، قاتو قـڕی ڕوویکـردە بیابانەکان، نوێنەری هۆزەکان سکاڵایان دەهێنا بۆ لای خەلیفە هیشام، کاتێك نوێنـەریان هاتە خزمەتی منداڵێکی (١٤) ساڵانەیان لەگەڵدا بـوو بـەناوی (دەرواسـی کـوری حـەبیب) کاتێ هیشام سەیریکرد نوێنەرەکەیان ئەوەندە منداڵە، بە دەرگەوانەکەی دیوەخاتی گوت: ئەم دیوەخانەی من قەدرو ڕێزی نەماوە کێ بیەوێت دێتە ژوورەوە تەنانەت منداڵیش؟

دەرواس وتـی: ئـەی پێـشەوای بـاوەڕداران! سـێ سـاڵ توشـی گرانـی و وشـکە سـاڵی هـاتوین: سـاڵێك پیـوو چـەوری توایـەوەو نـەما، سـاڵی دووەم لاواز بـووین و گۆشـت بـە ئێسقانەکانمانەوە نەما، ساڵی سێیەمیش خەریکـە ئێسقانەکانمان نـامێنێ، کەچـی مـاڵ و سامانی زۆرو بێ شومار لـەژێر دەسـتی ئێوەدایـە، ئەگـەر ئـەو مـاڵ و سـامانە هـی خوایـە دابەشی بکە بەسەر بەندە هەژارەکانی خوادا، ئەگـەر هـی بەندەکانیـشە ئـیتر بۆچـی لێـت شاردونەتەوە؟ خۆ ئەگەر هی خۆشتە بیکە بەخێرو بەشی هەژارانی لێ بدە، چونکە خـوای گەورە پاداشتی چاکەکاران وون ناکات، و بە چەند قات پاداشتیان دەداتەوە.

هیـشام وتـی: ئـەم منداڵـە بـەم وتـە شـیرن و جوانانـەی هـیچ بەهانـەیکی بـۆ ئێمـە نەهێشتۆتەوە، فەرمانیدا سەد هەزار دیرهەم بدەن بەبیابان نـشینەکان، و سـەد هـەزاریش بدەن بە دەرواس، دەرواس وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران! ئـەوەی منـیش بگێـڕەڕەوەو بیدە بە بیابان نشینەکان، چونکە دەترسم ئەوەی پێت بەخشیون بەشیان نەکات.

هیشام پێی وت: ئەی دەرواس تۆ چ پێویستیەکت هەیە بۆ خۆت تا بۆتی جێبەجێ بکەم؟ وتی: من هیچ پێویستیەکم نیە جگە لە پێوستی گشتی موسڵمانان!.. کاتێ منداڵەکە چووە دەرەوە بەڕێزترین و جوامێرترینی هۆزەکە بوو[١].

١ تربیە الأولاد فی الاسلام، د. عبدالله ناصح علوان، دار السلام.

# سەرگوزەشتەی شەست و حەوت

# جەنگی ئوحد

كاتێك موسڵمانان لە ماڵ دەرچوون بۆ جەنگی ئوحد، بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی بێباوەڕان ببنەوە، پێغەمبەر(ﷺ) سەیری سوپاكەی كرد منداڵی وەهای تێدابوو نەگەیشتبووە تەمەنی بالغ بوون، و لە ڕیزی پیاواندا ئامادەبوو بۆ جەنگ و بەرزكردنەوەی وشەی یەكتاپەرستی، پێغەمبەر(ﷺ) بەزەیی پێیاندا هاتەوەو لەبەر منداڵیان گێڕانیەوە، دووان لەوانە (رافعی كوری خەیج و سەمورەی كوری جوندوب) بوون، پاشان كە پێیان گوت: رافع تیرهاوێژێكی كارامەیە ڕێگەیدا بەشداری بكات، سەمورە دەستی كرد بە گریان، و بە مێردەكەی دایكی گوت: من بەهێزترم لە رافع و دەیدەم بەزەویدا كەچی پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی بەودا، بەڵام ڕێگەی بەمن نەدا، كاتێك هەواڵەكە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێدان زۆرانبازی بكەن، ئەوانیش زۆرانبازیان كرد سەمورە رافعی دا بە زەویدا، ئەمجا پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی بەویشدا بەشداری بكات[١].

١ تربیه الاولاد فی الاسلام، د. عبدالله ناصح علوان، دار السلام.

# سەرگوزەشتەی شەست و هەشت

## ڕۆڵە گیان لێرەوە هێرش بەرە سەر دوژمن

کاتێك موسڵمانان خۆیان ئامادەکرد بۆ جەنگی ئوحد، ئافرەتێك مندالێکی خۆی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) شمشێرەکەی بەستبووەوە بە باڵیەوە، چونکە توانای هەلگرتنی نەبوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو منداڵەم هێناوە لەگەڵ تۆ بێت بۆ جەنگ، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو: ڕۆڵە گیان لێرەوە هێرش بەرە سەر دوژمن، ئەمجا منداڵەکە هێرشی بردو بریندار بوو کەوت، پاشان هێنایانە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پێی فەرموو: ڕۆڵە گیان لەوانەیە ئارام نەگریت!! منداڵەکە گوتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئارام دەگرم.

# سه‌رگوزه‌شته‌ی شه‌ست و نۆ

# عومه‌یر گریا

سـه‌عدی كـوری ئـه‌بی وه‌قـاص(ﷺ) گێڕاویه‌تیـه‌وه كـه پێغه‌مبـه‌ر(ﷺ) پـێش ئـه‌وه‌ی ده‌رچێت بۆ جه‌نگی به‌در سه‌ردانی سوپاكه‌ی كرد، و عومه‌یری بارمم بینی له‌ناو ڕیزه‌كانـدا خۆی ده‌شارده‌وه بۆ ئه‌وه‌ی له‌به‌ر منداڵی نه‌یگێڕێته‌وه، پـێم گـوت: ئـه‌وه چیته براكـه‌م؟ گوتی: ده‌ترسم پێغه‌مبـه‌ر(ﷺ) بم بـینێ و بمگێڕێتـه‌وه، منـیش حـه‌ز ده‌كـه‌م ده‌رچـم بـۆ جه‌نگ به‌ڵكو خای گه‌وره پله‌ی به‌رزی شه‌هاده‌تم پێ ببه‌خشێت، له‌وكاته‌دا پێغه‌مبـه‌ر(ﷺ) چاوی پێی كه‌وت له‌به‌ر منـداڵی ڕێگـه‌ی نـه‌دا، عومـه‌یر گریـا، پێغه‌مبـه‌ر(ﷺ) رێگـه‌ی پێـدا به‌شداری بكات، سه‌عد(ﷺ) گوتی: له‌به‌ر منداڵی نه‌یده‌توانی شمشێره‌كه‌ی هه‌ڵگرێ.

# سەرگوزەشتەی حەفتا

## سەرپێچیم دەکەیت تۆ کوڕێکی کەنیزەکی؟

ئەبا عومـەیر کـوڕێکی هـەبوو لـە کـەنیزەکێك کـە خێزانـی بـوو، ڕۆژێکیـان پێـی گـوت: سەرپێچیم دەکەیت تۆ کوڕی کـەنیزەکی، کوڕەکـەی گـوتی: سـوێند بـەخوا دایکم لـە تـۆ چاکترە!! باوکی گـوتی: چۆن؟ کوڕەکـەی گـوتی: ئەگـەر تـۆ ئـافرەتێکی سەربەسـت و ئازادت هەڵبژاردایەو بتکردایەتە هاوسەری خۆت ئەوا منیش لە دایکێکی سەربەست و ئـازاد دەبووم، بەڵام خۆت هەڵبژاردنەکەت خراپ بوو بۆیە منیش کوڕی کەنیزەکم!!

# سەرگوزەشتەی حەفتاو یەك

## پەیمانم داوە بە دایکم درۆ نەکەم

یــەکێك لــە سەرگوزەشــتە وروژێنــەرەکان ســەبارەت بــە منــاڵ، شــێخ (عبــدالقادری گەیلانی)یە.

شێخ عبدالقادری گەیلانی دەڵێت: کاتێك لە ماڵ دەرچووم بەرەو شاری بەغداد، دایکم (٤٠) دیناری پێدام بۆ خــەرجی ڕۆژانــەم، و پــەیمانی لێــوەرگرتم کــە ڕاســتگۆ بم و هــەرگیز درۆنەکــەم، کاتێــك گەیــشتینە دەوروبــەری هەمــەدان، کۆمــەڵێ چــەتەمان لــێ پەیــدابوو، کاروانەکەیان رووتکردینەوە هەرچیەکمان پێبوو لێیان سەندین، یـەکێك لـە چـەتەکان دای بەلای مندا وتی: هیـچت پێیـە؟ گـوتم: چـل دینـارم پێیـە، وا گومـانی بـرد گاڵتـەی لەگـەڵ دەکەم لێیداو ڕۆیشت، یەکێکی تریان مـنی بـینی وتـی: هیـچت پێیـە؟ گـوتم: (٤٠) دینـارم پێیە، ئەمجا بردمی بۆ لای گەورەکەیان سەرۆکی چەتەکان،ئەویش پرسیاری لێکردم وتی: چی وایلێکردی ڕاستی بڵێی، لە وەڵامدا وتی: پەیمانم داوە بە دایکم کە درۆنەکـەم، ترسـام خیانەت لە بەڵێن و بەڵێنەکەی بکەم!!.. سەرۆکی چەتەکان ترسی لێ نیشت، کراسەکەی خۆی دادڕی و هاواریکرد وتی: تۆ ترسای خیانەت لە بەڵێن و پەیمانەکەی دایکت بکـەیت، بەڵام مـن ناترسـم خیانـەت لـە بـەڵێن و پـەیمانی خـوای پـەروەردگار دەکـەم؟!! پاشـان فەرمانی دەرکرد هەرچی شمەکی کاروانیەکان هەیە بیگێڕنـەوە بۆیـان، وتیـشی: ئـەوا مـن تەوبەم کردو پەشیمانم دەگەڕێمەوە بۆ لای خوا لەسەر دەسـتی تـۆدا، ئەوانەشـی لەگـەڵی بوون هەر هەموویان بەجارێك وتیان: تۆ گەورەی ئێمە بووی لـە چـەتەیی، دەبـێ لـە ئـەمڕۆ بەدواوە گەورەشمان بیت لە گەڕانەوە بۆ لای خودا.

# سەرگوزەشتەی حەفتاو دوو

# دڵ تێری موسڵمان

دەگێڕنـەوە لـە یەمەنـەوە (١٣) پیـاو و مێـرد منـداڵێك بـە نوێنەرایـەتی هـاتن بـۆ لای پێغەمبەر، ئەویش هەروەکو ڕەوشت و باوی تایبەتی خۆی هەریەکەی دیاری پێبەخشین، بـەڵام لـە دواییـدا پێغەمبـەر بـۆ دڵنیـایی خـۆی فـەرموی: ئایـا هـەموتان ئـەو دیـاری و بەخشیـــشەتان وەرگرتـــووە؟ ئـــەوانیش گوتیـــان: منـــداڵێکمان لـــەلای وڵاغـــەکانمان بەجێهێشتووە، ئەو وەرینەگرتووە، پێغەمبەر فەرموی: بڕۆن ئەو منداڵە بهێنن، با ئـەویش دیـاری خـۆی وەربگرێـت، لـە دوای ئامـادەبوونی منداڵەکـە، پێغەمبـەر ویـستی دیـاری پێشکەش بکات، ئـەو منداڵـە وتـی: ئـەی پێغەنمبـەری خـوا ویـست و خواسـتی مـن وەکـو هاوڕێکانم نیـە، هـەر چـەندە کـە ئـەوانیش هیـواو ئومێـدی موسـڵمانبوونیان هەیـە، بـەڵام بەخودا ئەو ئاوات و ئارەزووی مە منی بۆ هاتوم بۆ لای بەڕێزت ئەوەیـە، مـە تـۆ لـە خـودا بۆم بپاڕێیەوە کە لێم ڕازی بێـت، و میهرەبـانیم لەگەڵـدا بکـات، و لـێم خـۆش بێـت، و دڵـم تێربکات لە بـاوەڕ، پێغەمبـەریش بـۆی پاڕایـەوە، و دیـاری پـێ بەخـشی و بـەرەو یەمـەن گەڕانەوە، لە دوای ئەوە لە ساڵی (١٠) دەیەمدا چاوی بە کۆمـەڵێك لـەو پیاوانـە کـەوت لـە مینا، پێغەمبەر هەواڵی ئەو مێرد منداڵەی پرسی: ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبـەری خـوا ئێمە هەرگیز کەسی وەکو ئـەو خواپەرسـتمارن نـەدیتووە، پێغەمبـەر فـەرموی: بەڕاسـتی ئەوە بۆمن هەواڵێکی دڵ خۆشکەرو سەرسوڕهێنەر بوو، دوای فـەرموی: سـوپاس بـۆ خـوا هیـوادارم ئـەو منداڵـە بـە هـەموو ئاواتێـك بگـات، یـەکێك لەناویانـدا گـوتی: بۆچـی ئـەی پێغەمبەری خوا، ئینسان کـە دەمرێـت بەتـەواوی نامرێت؟ پێغەمبـەر فـەرموی: بەڕاسـتی هیواو ئاواتەکانی دونیا ئەوەندە زۆرن، مرۆڤ سەرقاڵی سەدان ئاواتیەتی[1].

---

١ قبسات من حياه الرسول، أحمد محمد عصاف.

# سەرگوزشتەی حەفتاو سێ

## مەرگی منالێك:

د.عەلی ئیحسان کە لەهەشتاکانەوە دەژی، و ژمارەیەکی زۆر لە کەس و کاری ئەنفال کراون، لە کۆتایی ساڵانی نەوەدەکاندا هاتەوە کوردستان بۆ سەردانی باوکی و کەس و لە چەمچەماڵ و من لە خزمەتیدا بووم، بۆی گێڕامەوە کە کچۆڵەیەکی بچکۆڵەی برازای چەند ئەیدوان نەدەچوو بۆ لای، زۆر هەوڵیدا تا هۆگری بوو، مامۆستا دەڵێ: سەرنجم دا ئەو کچۆڵە خوێن شیرینە بەو منالیە دەپاڕایەوەو دەویت: خوایە بمکە بە چۆلەکەیەك لە چۆلەکەکانی بەهەشت.. پاڕانەوەیەکی سەیر بوو، پرسیم ئەمە کێ فێری کردووە، وتیان: کەس فێری نەکردوەو لە خۆیەوە دەیلێت.. زۆری نەخایاند ڕۆژێکیان تووشی حاڵەتێك بوو تا گەیانمانە نەخۆشخانەی چەمچەماڵ گیانی دەرچوو، گەڕایەوە بۆ ژیانی هەتا هەتایی و کۆمەڵێ خەم و خەفەت و یادەوەری تاڵی بۆ ئێمە جێهێشت[1].

---

[1] نوێبونەوە، ئەندازیار عوسمان، لا١٩٧.

# سەرگوزەشتەی هەفتاو چوار

# مەرگی ژن و پیاوێکی پزیشك:

ژن و پیاوێکی میسری کە هەردووکیان پزیشك بوون، بۆ کارکردن ڕوو دەکەنە وڵاتی سعودیە، کچێکی تەمەن (١٠)ساڵیان دەبێت بەناوی (بەرائەت)، زۆر بلیمەت و لێهاتوو بوو، هەموو قورئانی لەبەر بوو، بەدەنگێکی زرۆ خۆش و بەتەجویدی تەواوەوە دەیخوێند، هەمیشە مامۆستاکەی پێی دەوت: بەرائەت تۆ هەق بوو لەناوەندی بوویتایە نەك لەسەرەتایی.

دایکی تووشی شێرپەنجە بوو، نەیدەزانی چۆن کچە جگەر گۆشە تاقانەکەی لەو مەسەلەیە تێ بگەیەنێ، ڕۆژێ پێی وت: کچی شیرنم ئەگەر من پێش تۆ چووم بۆ بەهەشت، ئاگادار ئەو قورئانە بە کە لەبەرت کردووە بۆ ئەوەی تۆش بێیت بۆ لام.. دایکە حاڵی خراپ دەبێ، و لە نەخۆشخانە دەکەوێت، ڕۆژێك تەلەفۆن بۆ مێردەکەی دەکەن کە حاڵی خراپەو بەڵکو زوو سەری بدات، ئەویش بەسەیارەکەی دێا بۆ سەردانی بۆ ئەوەی بەرائەت ئەو حاڵە خراپەی دایکی نەبینێ لەسەیارەکەدا جێی دێڵێت، کاتێك سەر لە هاوسەرەکەی دەدات و دەگەڕێتەوە لە شپرزی و ناڕەحەتیدا سەیارەیەك لێی دەدات و گیان دەسپێرێت، ژنەکەشی دوای (٥) ڕۆژ وەفات دەکات، ئەم کارەساتە دەنگ دەداتەوەو پیاوێکی سعودی دەوڵەمەند کەفالەتی بەرائەت دەکات...

دوای ماوەیەك ئازارێك لە قاچی (بەرائەت)دا پەیدا دەبێت، و دوای دەردەکەوێت کە بەرائەت تووشی شێرپەنجە بووە.

شێرپەنجەکە بە گیانیدا بڵاودەبێتەوە، بۆ چارەسەر دەیبەن بۆ بەریتانیا، لە بەریتانیاوە کەناڵی (الحافظ) بە تەلەفۆن پەیوەندی پێوە دەکەن، (بەرائەت) قورئانێك دەخوێنێت، تا تەواو دەبێت پێشکەشکاری بەرنامەکە دەگری...

كە تەواو دەبێت، پیشكەشكاری بەرنامەكە دەڵێت: (بەرائەت) سوێند بـەخوا تـا ئێـستا ئاوا بە كوڵ نەگریاوم.. ئەمجا دۆعای خێری زۆری بۆ دەكات.

(بەرائــەت) ئــەو قورئــان خوێندنــەی لــە ئینتــەرنێت لــە (یوتیـوب)دا هەیـە، یـەك دوو سرودیشی هەیە لەسەر دایكی كە یـەكێكیان بـەناوی (فرمێـسكە هـەتیوەكانم)ەوەیـە، كـە بەڕاستی بەرد دەكات بە ئاو..

كە بە (بەرائەت)یان وت: تووشی ئەو نەخۆشییە بووی وتی: سوپاس بۆ خوا دەچمەوە بۆ لای دایكو باوكم[1].

---

١ نوێبونەوە، ئەندازیار عوسمان، ل٢٢.

# سەرگوزەشتەی هەفتاو پێنج

# ئیبنو توفەیل

ئیبنو توفـەیل نـاوی (ئەبوبـەکری کـوری موحەممـەدی توفەیلـە)، لـە سـەدەی پێنجی کۆچی لە دایك بـووە، یـەکێك بـووە لـە خوێنـد کـارە زیرەکـەکانی ئیبنـو روشـد، بابـەتی پزیشکی لای ئەم زانایە تەواو کردوە، بوە بە یـەکێك لـە پزیـشکە تایبەتـەکانی (یـەعقوبی یوسفی مەنصوری) فەرمانڕەوای سەردەمی خۆی.

دواجـار بـیری لـەم بونـەوەرە کردۆتـەوە و پرسـیاری لـە خـۆی کـردووە، کـە کـێ ئـەم بونەوەری دروست کردووە.

(بۆکـۆك) دەڵـێ: توفـەیل بـە مامۆسـتای خـۆم دەزانم و لـە فەیلەسـوفە پایـەدارەکانی جیهانە.

سەرگوزەشتەکەش لە ژێر سەردێری (حی کوری یقضان)ە.

منالێکی بێ دایك و باوك لە دارستانێکی دوور لە ئاوایی دەدۆزنەوە، ئـەم منالـەش(حـی کوری یقضان)ە، ئاسکێك هەڵیدەگرێتەوەو بەشیری خۆی پەروەردەی دەکا تا وای لێ دێ توانا پەیدا بکات و کارەکانی خۆی جێبەجێ بکات، کە گەیشتە تەمەنی (٧) سـاڵان سـەیر دەکات لەشی ئەم جیاوازی هەیە لە لەشی ئاژەڵەکانی تری دەورو پشت، ئـەمان کۆتاییـان بە کلکە، لەشیان بە پەڕ یان بە توك داپۆشراوە، بۆیە هەڵئەسـێ بـە داپۆشـینی خـۆی بـە گەڵاو پاشان هـەموو لەشـی پـێ دادەپۆشـی، پـاش ماوەیـەك سـەیر دەکـا گـەڵاکان وشـك دەبن و دەکەونە خوارێ بۆیە دەیگۆڕێ بە پێـستی ئاژەڵـە مردوەکـانی دەوروبـەری، کـاتێ ئاسکەکە دایکی دەمرێ سەیر دەکا هیچ گۆڕانکاریەك نەبووە لە دیـوی دەرەوەی لەشـیدا، بۆیـە دەسـت دەکـا بەهەڵـدرینی سـەیری ئەندامـەکانی نـاوەوە یـەك لـە دوای یـەك دەکـا، دەبینێ لەو بۆشاییەدا پارچەیەك گۆشتی ماسولکەیی بەهێز هەیـە پـڕە لـە خـوێنی مـەیو،

بەمەدا بۆی دەردەکەوێ ئەگەر دڵ لە لێدان کەوت، ئەو کاتە گیاندار دەمرێ و ژیانی دەوەستێ.

جارێك ئاگرێك بەرپا دەبێ بەهۆی هەورە بروسکەو لەو دیمەنەدا ڕوناکی دەبینێ و دەوروبەری ڕوناك دەکاتەوە، هەست بە گەرمی دەکاو لەسەرما ڕزگاری دەبێت، پاشان ئەو گۆشتەی کە ماوەتەوە لە باڵندەو ئاژەڵە سوتاوەکان دەیخواو دەبینێ تامی خۆشە، جیاوازی هەیە لە گۆشتی کاڵ، بۆیە هەوڵ دەدا فێری ئاگر کردنەوە ببێ بۆ خۆگەرم کردنەوەو خۆش کردنی خواردنەکەی.

پاشان دێت هەستەکانی بەکاردێنێت، لەسەرنجداندا بۆی دەرکەوێت کە هەرچی هەیە لە چوار دەوریدا لە ژێر یاسای بون و نەماندایە، ئەم بونەوەرە دروست کراوە، دەبێ دروست کەرێکی هەبێ، ئەم بیرکرنەوە پاڵی پێوە دەنێت کە خوای پەروەردگار بدۆزێتەوە، سەیری دەوروبەری کردو بینی وێنە شیرنەکانی دەسەڵاتی پەروەردگاریان پێوە دیارە، هەرچیەك هەیە لە دروستکراوەکانی خوای پەروەردگارە، ئەم هەموو بیرکردنەوەی لەسەردەمی منداڵیدا بوو، بۆیە کەسێکی زیرەك و ژیتەڵی لێ دەرچوو.

کاتێ تەمەنی بوو بە (٣٥) ساڵ دەیویست بزانێت کام هەست لە هەستەکانی گەیاندویەتیە ئەم زانیاریە، تەمەنی منالی.. لەم دارستانەدا دەژیاو هەمیشە بیری لە گەورەیی دەسەڵاتی خوای گەورەی دەکردەوە.

پیاوێکی خواناس بۆ یەکەم جار هاتە ئەم بێشەیە لە وڵاتێکی دورەوە دەیویست دورە پەرێز بێت لە خەڵك، تا بتوانێ لێکۆڵینەوەی ورد بکات سەبارەت بە دەسەڵاتی پەروەردگار لەم بونەوەرەدا، ئەم پیاوە ناوی (ئەبسال) بوو کاتێ(حی کوری یقضان)ی بینی بۆ یەکەم جار ڕایکردو خۆی شاردەوە، بەڵام دوای چەندین جار بینین لێی نزیك کەوتەوە، و کەوتە وت و وێژ لەگەڵیدا، (حی کوری یقضان) لە (ئەبسال)ەوە ناوەکان فێربوو، پاش ماوەیەك توانی گفوگۆ بکات بە زمانەکەی (ئەبسال) ەوە ناوەکان فێربوو، پاش ماوەیەك توانی گفتوگۆ بکات بە زمانەکەی ئەبسال.

ئەمجا (ئەبسال) بردیەوە لەگەڵ خۆیدا بـۆ نـاو هۆزەکـەی، و ماوەیـەك بەوانـە وتنـەوە خەریك بوو، لە وانەکانیدا باسـی بـەهای پـارەو سـامانی بـۆ دەکـردن، و ئـەو شـتانەی بـۆ باسکردن کە بیرو هۆشی پێی گەیشتبوو، لاوازی دەسەڵاتی مرۆڤی بۆ ڕون دەکردنەوە، بۆ پەی بردن بە نهێنیەکانی پەروەردگار.

پاش ئەمە (ئەبسال) و(حی کوری یقضان) چوونە بێشەڵانەیەك و لەوێ دەسـتیان کـرد بە خواپەرستی، هەتا ئەو کاتەی خوا ویستی وابوو گیانیان لە دەست بدەن[1].

---

[1] المسلمون والعلم الحدیپ، عبدالرزاق نوفل، ترجمە: عیمان سید قادر.

# وتەی کۆتـایی

خوێنەری بەڕێز: ئەم سەرگوزەشتانەی باسمان کرد هەندێك شتی بە سودو بەکەڵکی لێوەردەگیرێت: بێگومان منالّی پێشینە چاکەکان پەروەردەکران لەسەر ڕزگاربوونی تەواو لە دوورە پەرێزی و دیاردەی هەستکردن بەنەنگی و شەرمکردن، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بوو، ڕادەهێنران لەسەر ئازایەتی و بوێری، باوکان لەگەڵ خۆیان منداڵەکانیان دەبرد بۆ کۆڕە گشتیەکان، و سەردانی هاوڕێکانیان، پاشان هانیشیان دەدان قسە بکەن لەبەردەم پیاوە گەورەکاندا، دەیاندانە دەست مامۆستای خاوەن بەلاغەت، و زمانپاراو تا فێری ئەوەیان بکات چۆن بدوێن لەگەڵ فەرمانڕەواو خەلیفەکاندا، پاشان پرس و ڕایان پێبکەن لە مەسەلە پێویستە گشتیەکاندا، و لەناو کۆڕو کۆبونەوەی زانایان و بیریارەکاندا دەربارەی پێویستیە زانستیەکان قسە بکەن و پرسیان پێ بکەن.

ئەمانەش هەر هەمووی بۆ گەشە پێدانی بوێری ئەدەبیە لە منالاّندا، وە چاندنی ئەو پەڕی مانای جوامێری و تێگەیشتن و هۆشیاریە لە دەرونیاندا.

ئیتر هیچ شتێك نەماوەتەوە بۆ پەروەردەکارنی ئەمڕۆ بەتایبەتی باوکان، تەنها ئەوەندە نەبێت دەستبگرن بە بنەماکانی ئەم پەروەردە چاکەوە تاکو منالاّن پەروەردە ببن لەسەر ئاشکرا قسەکردن بە تەواوی، و بوێری تەواو لە سنوری ئەدەب و ڕێزگرتن و چاودێری هەست و نەستی کەسانی تر، و دانەبەراندنی پلەو پایەیان.. ئەگینا بوێریەکەیان دەگۆڕێت بۆ بێئابرویی، بەئاشکرا قسەکردنەکەیان دەگۆڕێت بۆ بێ ئەدەبی لەگەڵ کەسانی تر.

ئێستا زانیت کەوا چۆن ئەم منالاّنە پەیامی خوای پەروەردگاریان بە هەموو جیهان ناساند، ئایا تۆش دەتوانیت بیرو بڕوات وەکو ئەو منالاّنە لێ بکەیت، و پەیامی خوا بپارێزی و ڕایبگەیەنیت.

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوێنەری سەنگین: لە دوای خوێندنەوەی ئەم سەرگوزەشتانە ئەم کتێبە بدەرە دەست یەکێکی تر با سودی لێوەربگرێت، و بیخوێنێتەوە، گەر توانیت بۆ نەخوێندەوارەکانیش بخوێنەوە، و هاوڕێکانیشت لێی ئاگادار بکەوە.

داوای گەردەن لێبودرنیش دەکەم لە هەر کەم و کورپیەك کە هەم بوو بێت، چونکە هـیچ مرۆڤێك بیٚ کەم و کوری نابێت، ئەگەر لە شتێکدا هەڵەم کردبوو بۆم چاك بکەنەوە، خـوای پەروەردگار پاداشتی هەموو لایەك بداتەوە.

ئـــیتر خوایـــە گیـــان بـــژێوی و ڕزقمـــان بـــدە، و بـــە بەرەکـــەتی بکـــە. ئـــەی پـــەروەردگاری جیهانیـــان بـــە ڕاســـتی و دروســـتی لـــە بڕوادارانمـــان بگێـــڕە. لە خوای پەروەردگار دەپاڕێمەوە کە بەبەهەشتی پـان و بـەرینی خـۆی شـادمان بکـات، و دورمان بخات لە ئاگری دۆزەخ.

وصل الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

# سەرچاوەکان

١ـ قورئانی پیرۆز.

٢ـ الإصابة في تمييز الصحابة، إبن حجر العسقلاني، تحقيق: خيري سعيد، المكتبة التوفيقية.

٣- أختاه أخطأة الطريق، يوسف الحاج أحمد.

٤ـ الإيمان بالقضاء والقدر، فضيلة الشيخ محمد حسان، مكتبة فياض ١٤٢٧هـ ٢٠٠٦ ز.

٥ـ ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم، کۆکردنەوەی: ئاوات ئەبوبەکر ئەحمەد، چاپی دووەم ٢٠٠٥.

٦ـ البداية والنهاية، للإمام الحافظ عمادالدين أبي الفداء إسماعيل بن كثير القرشي الدمشقي، مكتبة الصفا، ط١، ١٤٢٣هـ.

٧ـ بعثة عكاظ، محمد مداري، المشاعر، الإثنين ١٤٢٥/١/١٤.

٨- تربية الأولاد في الإسلام، د.عبدالله ناصح علوان، دار السلام.

٩- تەفسیری ڕامان لە ماناو مەبەستی قورئان، ئەحمەد کاکە محمود، چاپی یەکەم، ١٤٢٨ك – ٢٠٠٧ز، نەشری ئیحسان.

١٠ـ پوختەی تەفسیری قورئان: ئامادەکردنی مەلا محمد مەلا صالح.

١١ـ دین و ژین لە ژێر ڕۆشنایی ڕسپاردەکانی رب العالمین، فاتح مەلا رسول شارستانیی، چاپی یەکەم ١٤٢٦ ك ٢٠٠٥ ز، چاپخانەی سیما.

١٢ـ دموع تائبة، يوسف الحاج أحمد، مكتبة ابن حجر، الطبعة الأولى ١٤٢٤ه ٢٠٠٣م.

١٣ـ روض الرياحين في حكايات الصاحين، عفيف الدين أبي السعادات العلامة عبدالله بن أسعد اليافعي اليمني ثم المكي، ٦٧٨ـ٧٦٨ ه، تحقيق الدكتور محمد عبدالرحمن ويسي، دار الحياة، حلب ـ سورية.

١٤- ڕۆژنامەی (الهدف) ی کوێتی، ژمارە (١٨٦٧).

١٥ـ شرح رياض الصالحين من كلام سيد المرسلين، تأليف الإمام أبي زكريا يحيى بن شرف النووي الدمشقي، دار ابن عصاصة بيروت – لبنان، الطبعة الأولى ١٤٢٧ه ـ ٢٠٠٦ م.

١٦ـ السيرة النبوية، د. علي محمد محمد الصلابي. دار ابن كثير دمشق ـ بيروت الطبعة الرابعة ١٤٢٧ه ـ٢٠٠٦م.

١٧ـ صحيح مسلم، تأليف الإمام أبي الحسين مسلم بن الحجاج شرحه الإمام النووي، دار ابن الهيثم القاهرة الطبعة الأولى ٢٠٠٣.

١٨– ضحايا الشيطان يوسف الحاج أحمد.

١٩ـ صور من حياة الصحابة، عبدالرحمن الباشا.

٢٠ـ فتح الباري بشرح صحيح البخاري، لإمام احمد بن علي بن حجر العسقلاني، مكتبة الصفا، الطبعة الأولى ١٤٢٤هـ ٢٠٠٣م.

٢١ـ فەرهەنگی دەریا، عەرەبی کوردی، ئامادەکردنی: ڕزگار کەریم، نەشری ئیحسان، چاپی یەکەم، ٢٠٠٦.

٢٢ـ قصص الهداية، عمرو خالد، إعداد وتنسيق: فوزية جذبة، دار الإصلاح للطباعة والنشر والتوزيع الطبعة الأولى ٢٠٠٥.

٢٣ـ المستطرف في كل فن مستظرف، شهاب الدين محمد بن أحمد الأشبيهي، تحقيق: محمد خير طعمه الحلبي، دار المعرفة بيروت ـ لبنان، الطبعة الخامسة ١٤٢٨ ه ٢٠٠٨ م.

٢٤– المجموعة الذهبية، د. محمد بن عبدالرحمن العريفي.

٢٥– المسلمون والعلم الحديث، عبدالرزاق نوفل،ط١.

٢٦ـ نضرة مرگ، خواجە محمد ئیسلامی پاکستانی.

٢٧ـ لەگەڵ چەند سەرچاوەیەکی تر کە ئاماژەیان پێکراوە.

# ناوەڕۆك

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|